# هەڵوێستی هزری ئیسلامی سەبارەت بە

# عەلمانییەت


**نووسینی:** سفر عبدالرحمن الحوالي

**وەرگێڕانی: باوکی موحەممەد**

پیاچوونەوە و هەڵەچنی: باوکی میرۆ

## پێشەکیی وەرگێڕ

# بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَقَالَ اللَّهُ لا تَتَّخِذُوا إِلَهَيْنِ اثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ* وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَهُ الدِّينُ وَاصِباً أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ﴾ [النحل:٥١-٥٢].

لەم ماوەی ڕابوردوودا هەندێك لەوانەی لەوەوپێش وەك تابووری پێنجەم لەناو میللەتی موسڵماندا خۆیان حەشار دابوو، ئەوانەی دڵیان بە کوفر و دووڕوویی و ڕق و قین لە ئیسلام ئاو درابوو، وایان زانی بارودۆخی ئێستە و پاڵپشتیی ئەمریکا و ڕێکخرەوە نەسرانییەکان لە پرۆژەی بەڕۆژئاواییکردنی کوردستان لە پارسەنگی ئەوانە و کاتی ئەوە هاتووە بەئاشکرا گوزارش لە بیروباوەڕی خۆیان بکەن، دەمامکیان لە ڕووی خۆیان لادا و ئیعلانی دژایەتیکردنی ئیسلامیان ئاشکرا کرد و بانگەشەی بەعەلمانیکردنی کۆمەڵگای کوردی (موسڵمان)یان کرد. بێ هیچ ئیعتیبارێك بۆ سەدان هەزار موسڵمان، ئەمانە بانگەشەی جیاکردنەوەی ئیسلامیان لە ژیان کرد. لەناو نزیکەی پێنج ملیۆن موسڵمانی کورد، چوار هەزار بێباوەڕی عەلمانی ئیمزایان کۆ کردەوە و کەمپینێکی بچووکیان دامەزراند و ناویان لێ نا "کەمپینی جیهانی"!!!

هەرچەند زۆرینەی میللەتی کورد موسڵمانە، بەڵام هەوادارانی عەلمانییەت هەر لەکۆنەوە و بە ناو و دروشمی بریقەدار توانیویانە بەدرۆ و چەواشەکردن زۆریك موسڵمانی بێئاگا هەڵخەڵەتێنن و لە ئاوی لێڵدا مەلە بکەن. تەنانەت ئێستەش کە کۆمەڵێکیان بەتەواوی ڕووی خۆیان هەڵماڵیوە، بۆ ئەوەی جەماوەری خەڵکی لێیان نەڕەنجێ، بێشەرمانە دەڵێن ئێمە هیچ دژایەتیی ئایین (ئیسلام) ناکەین، بەڵکوو لە بەرژەوەندیی موسڵمانەکانیشین کاتێك دەڵێن ئیسلام لە ژیان و سەرقاڵیی دەسەڵات دوور بخرێتەوە و گۆشەگیر و ئیفلیج بکرێت!!!

دەبێ ئەوەش بزانین کە جەنگی نێوان ئیسلام و عەلمانییەت و ئیسلامییەکان و عەلمانییەکان هەمەڕەنگ و هەمەلایەن بەدرێژاییی مێژوو ڕیشەی هەیە و بە نامیلکەیەك یان کتێبێك کۆتایی نایەت. چونکە ئەوانە بڕیاریان داوە تا کۆتاییی هەناسەیان و تا سەرئێسقان دژایەتی خوا و بەرنامەی خوا بکەن و ئێمەش بڕیارمان داوە تا کۆتایین هەناسە و تا سەرئێسقان خۆمان و ژیان و ماڵ و حاڵمان لە خزمەتی بەرنامەی خوادا بێت و سڵ نەکەینەوە لە ڕووهەڵماڵین و پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی قرچۆکیان و وریاکردنەوەی موسڵمانان لە فرتوفێڵ و نەخشە و پیلانی ژەهراوییان.

ئەم نامیلکەیە پوختەی بابەتێکی گرنگ و بەهەندی مامۆستای بەڕێز، شۆڕەسواری گۆڕەپانی بانگەواز، ڕووشکێن و ئابڕووبەری عەلمانییەت و پشتشکێنی عەلمانییەکان، ئیبنتەیمییەی سەردەمی خۆی، مامۆستا (سفر عبدالرحمن الحوالي)یە، خوا تەمەنی درێژ بکات.

ئەمەش وەك بەرکوڵێکە و خوا یار بێت هەوڵ دەدەین کە لە داهاتوودا کتێبە بەناوبانگەکەی **(العلمانية نشأتها وتطورها وآثارها في الحياة الإسلامية المعاصرة)** بڕگەبڕگە بخەینە بەردەم خوێنەری بەڕێز.

باوکی موحەممەد
جومادی یەکەمی ١٤٢٨ك
ئایاری ٢٠٠٧ز

## کورتەی ئەم بابەتە

عەلمانییەت ئەسڵ و بنچینەکەی شیرك و ئەفسانەیە. لە سەردەمی یەکەمدا و لەدوای بەرزبوونەوەی مەسیح لە دەرەنجامی شێواندنی ئایین و دەسەڵاتی کاهینەکان بەسەر خەڵك و ئاییندا پەرەی سەند. ئەو کاتەی ئەحبار و ڕاهیبەکان بوونە چەند خوایەك و فەرمانیان بۆ خەڵکی دادەنا و حەڵاڵ و حەرامیان بۆ خۆیان قۆرخ کردبوو. جوولەکەش ڕۆڵێکی گەورەی لە سەرهەڵدان و گەشەکردنی عەلمانییەتدا بینیوە.

بەڵام عەلمانییەتی نوێ لەگەڵ سەرەتای شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشی فەرەنسادا هاتۆتە کایەوە. هۆکاری سەرەکیش لە ڕاپەڕین و هەڵسانی ئەورووپا بەڕووی کەنیسە و ئەفسانەکانی کەنیسەدا، سوودمەندی بوو لە موسڵمانەکان؛ تەنانەت سەرەتای مێژووی زانستیی ئەورووپاییەکان لەگەڵ فەتحی ئیسلامی بۆ قوستەنتینییە دەستی پێ کردووە.

## ١- عەلمانییەت ئەفسانەیەکی دژ و پێچەوانەیە بە ئیسلام

پێش ئەوەی دەست بە بابەتەکە بکەین، دەمەوێت ئاماژە بە هەندێ خاڵ بکەم کە ڕەنگە شتێکی ڕیشەیی بن؛ هەرچەند ئێمەی مسوڵمان پێویستە جیاوازی نەکەین لەنێوان ڕووکەش و ناوەڕۆکدا، بەڵکوو لەسەرمانە چەندمان لەتوانادا بوو، پێیانەوە پابەند بین.

با هەر لە ناونیشانەکە خۆیەوە دەست بە مەسەلەکە بکەین. ناونیشانەکە مەبەست پێی بەراوردکردن لەنێوان دوو هزری بەرامبەردا نییە. ئێمە بەردەوام دەبێت لەو ڕووەوە باس لە هزری ئیسلامی بکەین کە ئەو وەحی و نیگایەیە کە خوا ناردوویەتییە خوارەوە. کارێکە هەڵە و چەواشەکاری هەڵناگرێت. ئەو خوایە ناردوویەتیە خوارەوە کە نهێنی و پەنهانیی ئاسمانەکان و زەوی لای ئەوە. پێغەمبەرانیش -سەلامیان لێ بێت- بە چاکترین شێوە و بێ هەڵە گەیاندوویانە بە ئێمە. واتە مەبەستمان لە هزری ئیسلامی لێرەدا ئەو وەحییە خواییەیە کە هەڵە، لەکە و ناتەواوی هەڵناگرێت.

لە بەرامبەری ئەمەشدا هەوا و ئارەزوو و نەفامی و ئەفسانەیە یان هەر ناوێکی ترت پێ خۆشە. ئیتر با هەر دروشمێك یان هەر ناوێکی هەبێت و لە هەر کات و شوێنێکدا بێت؛ مادەم لە نیگای خواییەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بێ گومان نەفامی و ئەفسانەیە، مەگەر تێگەیشتن و فەهمێك کە باوەڕدار لە کیتابی خوا و سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پەی پێ دەبات.

جا ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە سەیری عەلمانییەتمان کرد، دەبینین مەسەلەکە بەم شێوەیەیە؛ تەوحید و یەکخواپەرستی کە پێغەمبەران پێی هاتوون و بانگەشەیان بۆ کردووە و کتێبەکانی لەپێناو هاتۆتە خوارەوە، لە بەرامبەریدا شیرك و جەهالەت و ئەفسانە و کاردانەوەی مرۆڤ، کە لە چەند ماوەی دیاریکراو و گەلانێکی دیاریکراوەوە سەری هەڵداوە. ئەم جەهالەتە بە هیچ شێوە و جۆرێك ناکرێت و ناگونجێت بکرێتە بنەما و پەیڕەوێك مرۆڤایەتی لە هەر کات و شوێنێکدا لەسەری بڕوات و بەختەوەری بکات. بەتایبەت ئەوانە کە نیگای پاك و بێگەردی خوایی لەنێویاندا بێت و پێی ئاشنا بووبن، شەو و ڕۆژ بیخوێننەوە و لەگەڵیدا بژین. جا ئەم بابەتە لێرەوە و لەم مەسەلەیەوە دەستپێ دەکات.

خوای گەورە پێغەمبەرانی تەنها بۆ ئەوە ناردووە تاکوو خەڵکی بانگ بکەن بۆ بەندایەتیکردنی خوا بە تاك و تەنها و هیچ هاوەڵ و هاوشانی بۆ بڕیار نەدەن. خوای گەورە باسمان بۆ دەکات کە هەموو پێغەمبەرانی ناردووە تاکوو بە گەلەکانی خۆیان بڵێن: ﴿أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ [الأنبياء: ٢٥]. ﴿أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾ **[النحل: ٣٦]**. **ماناى (لا إله إلا الله)** بەندایەتی و گوێڕایەڵی خوا و دوورەپەرێزییە لە تاغووت. ئەمە کە لەدوای گەورەترین ئایەتی قورئان کە (آية الكرسي)یە، باسی کردووە و دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ **[البقرة: ٢٥٦]**. ئەمانە هەمووی بـــــەڕۆشنی مانای شایەتمان بە **(لا إله إلا الله)** ڕوون دەکەنەوە. جا هەر کۆمەڵگایەك باوەڕی بەم ئایەتانە بێت و ماناکانی بزانێت و لە خۆیدا بەجێیان بێنێت، بە هیچ جۆرێك ناکرێت و ناگونجێت کۆمەڵگایەکی عەلمانی بێت و بانگەشەی عەلمانییەت بکات و تەنانەت پێشی ڕازی بێت. چونکە مەسەلەی ڕازیبوون بە حوکم و فەرمانی خوا و وەرگرتن و ڕازیبوون بە عەلمانییەت، دوو مەسەلەی دژبەیەکن و هەرگیز لە هیچ بارودۆخێکدا ناکرێت بەیەکەوە کۆ ببنەوە.

مەبەستیشم لە ئەفسانە ئەوەیە کە مرۆڤ وێنەیەك لە گومڕایی و داهێنراو (بدعة) و لادان بۆ خۆی داتاشێت و جگە لەوەی خوا بۆی هێناوەتە خوارەوە و بیکاتە بەرنامەی ژیانی. جا کاتێك لە هەر کۆمەڵێکدا ئەفسانە بڵاو بوویەوە، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەبێتە مۆڵگەیەکی گونجاو بۆ گەراکردنی بیرۆکەی عەلمانییەت و بەپێی هێلانەکردن و گەراکردنی ئەفسانە و خورافات لەو کۆمەڵگایەدا، ئامادەی وەرگرتنی عەلمانییەت و هەر بیرۆکەیەکی دیکە دەبێت جا عەلمانییەتی بەشی (جزئی) بێت یان عەلمانییەتی تەواو گشتی (كلي).

عەلمانییەت ئەو پەیڕەوە هزرییە ناسراوەیە کە سەرەتا لە ئەورووپاوە گەشەی کردووە و بڵاو بۆتەوە. ئەوروپا کە کیشوەرێکی تاریك، گومڕا و سەرلێشواو بوو، مۆڵگەی بیر و بیرۆکەی لادەر و دوور لە هیدایەتی خوایی بوو. بە هیچ جۆرێکیش لێی دەرناچێت و سەرفراز نابێت تا شوێن هیدایەت و بەرنامەی پەروەردگار نەکەوێت. ئەوانە بە سەردەمێکی مێژوویی خۆیان دەڵێن چاخی تاریکی، وەك ئەوەی ئێستە لە ڕووناکیدا بن؛ بەڵام لەڕاستیدا ئەورووپا لە تاریکایی دەرنەچووە و لێشی دەرناچێت تاکوو باوەڕ بە خوای تاك و تەنها نەهێنێت و شوێن ئایینەکەی نەکەوێت کە ئەویش ئیسلامە و هیچ ئایینێکی تر جگە لەو وەرناگیرێت. ئەورووپا هەر لەکۆنەوە و تا ئێستەش لە تاریکییەوە بەرەو تاریکی هەنگاو دەنێت و تێیدا دەتلێتەوە، لە تاریکییەوە بۆ تاریکی بەردەوامە تا ئەمڕۆ.

گەشەکردن و سەرهەڵدانی عەلمانییەت لە ئەورووپادا، لە دەرەنجامی بیرکردنەوە و تێڕوانینێکی ژیربێژی (منطقي) و زانستی نەبوو وەك لە ناوەکەیەوە هەستی پێ دەکرێت، بەڵکوو کۆمەڵە هۆکارێکی دیکە بوون کە لەم بابەتەماندا دەمانەوێت تیشکیان بخەینە سەر. چونکە بیرکردنەوەی دروست و زانست و زانیاریی بە هیچ جۆرێك دژ و پێچەوانە نین بەوەی خوا هێناویەتییە خوارەوە بۆ مرۆڤ لە نوور و هیدایەت و ڕێنموونی و دوو شتی تەریبن نەك پێچەوانەبەیەك. بەڵکوو وەك چەند کاردانەوە و دژکردەوەیەکی بەردەوامی ئەو نەفامی و ئەفسانەیە بوو کە بەهۆی شێواندن و گۆڕین و لادانی ئایینەوە (ئایینی نەسرانی) بەتەواوی باڵی بەسەر ئەورووپادا کشابوو. تروسکەی ڕووناکی و هیدایەتی لێ قەتیس کردبوو، کە ئەگەر بمانەوێت بیخەینە پێش و لێی بدوێین، دەبێت باس لە مێژوویەکی دوورودرێژ و قووڵ بکەین، کە هەر لەساڵی (٣٢٥ز) لەو کاتەوە ئیمپراتۆریی ڕۆمانی دێتە ناو مەسیحییەتەوە و ئەوەی کە ئێستە بە مەسیحییەت ناو دەبرێت، دەیکاتە ئایینی فەرمیی خۆی و ئیمپراتۆرییەکە بە زەبر و زەنگ و هێزی ئاگر و ئاسن دەیسەپێنێت بەسەر خەڵکیدا، کە بە لانی کەمەوە ئەو جەهل و ئەفسانەیە تا ئەمڕۆی ئێمەش هەر بەردەوامە.

### ٢- هۆکارەکانی گەشەکردن و سەرهەڵدانی عەلمانییەت لە ئەورووپادا

ئەورووپا هەر لەسەرەتاوە لە کۆمەڵێك ئەفسانە و نەفامیدا دەژیا. ئەفسانە، خەیاڵ، نەخوێندەواری و نەفامی باڵی ڕەشی کێشابوو بەسەریدا. لێرەوە و بۆ ڕزگاربوونی خۆی لەو کۆت و زنجیرە ڕووی لە ئەفسانەیەکی تر کرد، کە ئەویش عەلمانییەت بوو.

## رۆڵی عەلمانییەت لە هزری نەسرانییەتدا

خوای گەورە پێغەمبەرانی پێش عیسا -سەلامی لێ بێت- بە چی ناردوون و چی فەرمانێکی پێ داون، هەر ئەویشی بە عیسا داوە و هەمان داواکاریشی لەو بووە؛ ئەویش کە ڕوو بە هەموویان فەرموویەتی: ﴿أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾ [النحل: ٣٦]. ناشگونجێت هیچ پێغەمبەرێك بانگەشە بۆ شیرك و هاوەڵگیری بکات، جا باشە کەوایە، ئەی چۆن شیرك و هاوەڵگیری و ئەفسانە لە ئایینی نەسرانیدا پەیدا بوو؟

یەکەم وەرچەرخانی گرنگ کە لە ئایینی نەسرانیدا ڕووی دا، ئەوە بوو کە عیسا -سەلامی لێ بێت- پێش ئەوەی کۆمەڵگایەك لەسەر بنەمای تەوحید، دادگەری و خواناسی دامەزرێنێت، پێش ئەوەی دەوڵەتێکی خاوەن دەستوور و یاسا پێك بێنێت، خوا بردیەوە بۆ لای خۆی و بەرزی کردەوە. کەواتە نەتوانرا کۆمەڵگایەك لەسەر بنەما و شەریعەتی عیسا دروست بکرێت. عیسا -سەلامی لێ بێت- لە فەلەستین نێردرا بۆ نەوەی ئیسرائیل لە فەلەستین کە ئەو کاتە بەشێك بوو لە داگیرکراوەکانی ئیمپراتۆریی گەورەی ڕۆمان. ئیمبراتۆریی ئەو کاتەش وەك کێشەیەکی ناوخۆیی بچووك دەیڕوانییە ململانێ و دژایەتیی نێوان عیسا و جوولەکەکان و بە شایەنی ئەوەی نەدەزانی خۆی تێهەڵقورتێنێت و خۆی بکاتە بەشێك لەو کێشە بچووکە. چونکە نەیدەویست وڵات و ویلایەتەکانی ژێر دەسەڵاتی پەرت و پارچەپارچە ببن و دەسەڵاتی لاواز ببێت. سوور بوو لەسەر ئەوەی دەسەڵاتی لە هەموو جێگەیەکی ئیمپراتۆرییەکەیدا بەهێز و بەرقەرار بێت. ئەم پیاوەش –عیسا- لە بەشێك لە دەسەڵاتەکەیدا هاتووە و بانگەوازێکی تایبەتی بۆ گەلێکی دیاریکراو (نەوەی ئیسرائیل) پێیە و هیچی تر.

جا لێرەوە دوو مەسەلە هاتنە ئاراوە:

مەسەلەی یەکەم: مەسەلەی ئەوەی کە عیسا -سەلامی لێ بێت- دەوڵەتی دروست نەکرد؛ ئەوەش وای کرد کە هەر لێرەوە ڕیشە و تۆوی عەلمانییەت لە بیر و هزری ئەواندا هەر لەزووەوە بوونی هەبێت. کاتێك کە عیسا -سەلامی لێ بێت- دەوڵەتێکی سەربەخۆی جیاوازی جیهادی دروست نەکرد وەك پێغەمبەری خوا (صلى اللە علیە وسلم) کە لە مەدینەدا کردی و بناغەیەکی پتەوی بۆ دانا.
کاتێك مەسیح -سەلامی لێ بێت- هیچ بنەما و دەستوورێکی بۆ حوکم و فەرمانڕەوایی دانەنا وەك پێغەمبەری خوا (صلى اللە علیە وسلم) کردی، ئەمە بێ هەستپێکردن بووە هۆی چاندنی تۆوی عەلمانییەت بەو مانایەی کە دەگونجێت و دەکرێت ئایین هەبێت، بەڵام هیچ بانگەواز و جیهاد و تێکۆشانی لەپێناودا نەکرێت و ئایین لە شوێنی خۆی و حوکم و دەسەڵاتیش لە شوێنی خۆی.

مەسەلەکەی تر: ئەوەیە کە ئەم ئایینە لە بانگەوازێکی تاکەکەسی و بۆ گەلێکی تایبەتەوە، گۆڕا بە ئایینی ئیمپراتۆری و لەوێشەوە گوێزرایەوە بۆ ئایینی گەلانی ژێر دەسەڵاتی ئێمپراتۆرییەکە، کە چەندەها گەل و نەتەوە و وڵاتانی ئەو کاتەی دەگرتەوە و ڕەنگ بێت گەورەترین ئیمپراتۆریی ئەو کاتەی سەرزەوی بووبێت. جا لێرەوە ئەم بازدان و گۆڕانکارییە، زۆر گرنگە بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە. چونکە کاتێك مەسیح نەیتوانی تەنانەت لەنێو ئەو گەلەشدا کە بۆی نێردرا ئەم ئایینە بەرجەستە بکەن و حوکم و فەرمانڕەوایی پێ بکەن، دەی کەواتە چۆن لە ئاستی زۆر گەورەتر و بەرفراوانتر لە خۆیاندا بەجێ دێت؟!

کەواتە لێرەوە هەر دەبێت بواری یاسا و تەشریعات بەرتەسکتر بێت لەوەی بتوانێت گشت فەرمان و پێشهاتووەکان لەخۆ بگرێت. ئایینێك بواری بۆ نەلوابێت و نەیتوانیبێت بەسەر کۆمەڵێکی زۆر کەم و تایبەتدا فەرمانڕەوایی بووبێت، چۆن ئێستە دەکرێت حوکمی هەموو جیهانی ئەو کاتەی پێ بکرێت، لە کاتێکدا کەمێکی زۆر کەم نەبێت تەشریع و یاسای تێدا نییە؟!

لێرەدا ڕەخنە و بەرهەڵستکاری لەوەدا نییە کە بۆ ئینجیل بە دەستوور و یاسا و تەشریعی تەواو نەهاتووە بۆ گشت مرۆڤایەتی. هیچ جۆرە ڕەخنە و گازندەیەك لەمە نییە، چونکە خوا (سبحانە وتعالی) مەسیحی بۆ ئەوە نەناردووە تا پەیامەکەی جیهانی و گشگیر بێت، بەڵکوو تەنها موحەممەدی (صلی اللە علیه وسلم) بەو پەیامە جیهانییە ناردووە و ئەوەی تایبەتمەند کردووە و ئایینەکەی گێڕاوە بە کۆتاییی ئایینەکان و ئەوەی مرۆڤ پێویستی پێیەتی لە ژیانیدا بۆی داناوە.

بەڵام ئەهلی ئینجیل و تەورات کە هەردووکیان لە نەوەی ئیسرائیلن، تەنانەت ئەم ئایینە قۆناغییەشیان بە پاکی و بێ دەستکاری و بێ هەڵە نەگەیاندە ئەورووپا و لێرەوە گەورەترین هەڵە پەیدا بوو؛ ئەویش کە ئایینی خوا بە شێواوی و خواروخێچ گەیشتە گەلانی ئەورووپا.

## هەڵبەستن و شێواندن لە ئایینی نەسرانیدا

سەرەتا و دەستپێکردنی شێوان و گۆڕینی ئایینی نەسرانی دەگەڕێتەوە بۆ کەسێك بە ناوی پۆلس (شاوول). لە هاتنی ئەم کابرایەوە ئیتر ئایینی نەسرانی لە کرۆك و حەقیقەتی خۆی شێوێنرا و تا ئێستەش هەر بەردەوامە.

لەبەر ئەوەی دەبینین مێژوونووسانی ڕۆژئاوا پێناسەی مەسحییەت دەکەن و دەڵێن دەکرێت بە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم: مەسیحییەتی یەسووعی، یان مەسحییەتی یەسووع، واتە عیسا -سەلامی لێ بێت-. دەڵێنساڵی ئەوەندە دەستی پێ کردووە و ساڵی ئەوەندەش کۆتایی هاتووە؛ ئەمەش مەسحییەتێکی سەربەخۆ بووە.

بەشی دووەم: مەسیحییەتی فەرمی (ڕەسمی)؛ ناونرا بە فەرمی چونکە ئیمپراتۆری ڕۆم قوستەنتین خۆی بووە مەسیحی و کردیشییە ئایینی فەرمیی دەوڵەت. ئیتر لێرەوە مەسیحییەت قۆناغێکی تری وەرگرت و هەنگاوێکی دیکەی نا.

بەناوبانگترین کەسایەتی و پاڵەوانی شێواندن و لادانی ئایینی نەسرانی، جوولەکەیەك بوو بە ناوی (شاوول) کە پاش بەمەسیحیبوونی ناوی خۆی نا (پۆلس).

(پۆلس) کابرایەکی جوولەکە بوو. ناوە جوویییەکەی (شاوول)ە. لە سەرەتای هاتنی عیسادا -سەلامی خوای لێ بێت- جوولەکە دژایەتییان کرد و بوونە بەرهەڵستی و بوونە نەیاری خۆی و بانگەوازەکەی. کەوتنە ئەشکەنجە و ئازاری شوێنکەوتووانی، تەنانەت تۆمەتی ئەوەشیان دایە پاڵی کە کوڕی زینایە و وتیان دایکی بە زینا بوویەتی (پەنا بە خوا). ئیتر بەم شێوە بەردەوام بوون تا لە داهاتوودا بووە سەرچاوەی نەهامەتی و سەرلێشێوانی گەلانی ژێردەستەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریی ڕۆمان و پاشان ئەورووپا بەگشتی و تا ئێستەش.[1]

پۆلس تاکوو ئایینی نەسرانییەت لەڕەگ دەربێنێت، هەستا ڕۆح و کرۆکەکەی دەرهێنا -کە تەوحیدە- و وەك لاشەیەکی بێگیان هێشتییەوە؛ وەك لە نامەی (أعمال الرسل)دا لە ئینجیلەکاندا چاپ کراوە. پۆلس ئەشکەنجە و ئازاری مەسیحییە خواپەرستەکانی دەدا، بەڵام لەپڕێکدا و لە گەرمەی ڕاونانی شوێنکەوتوانی مەسیحدا، هەڵگەڕایەوە و بووە مەسیحی و بەڵکوو بووە سەری مەسیحییەت و ئێستە مەسیحییەت بە (پۆلس)ەوە دەناسرێتەوە. پۆلس دەڵێت کە کاتێك بەرەو دیمەشق بە مەبەستی ئازاردان و ڕاونانی مەسیحییەکان بەڕێ کەوتووە، لە ڕێگەدا ڕووناکییەك لە ئاسمانەوە بەدی دەکات. ڕووناکییەکە دەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵیدا -کە ئەفسانەیە- و پێی دەڵێت: من کوڕی خوام، بۆچی و تاکەی بەو شێوەیە شوێنکەوتووانم ئەشکەنجە دەدەیت؟
دەڵێت: ئیتر زانیم ئەمە مەسیحە و گەڕامەوە و ئیمانم پێی هێنا!

ئەم ڕووداوە بووە سەرەتای گۆڕینی ئاڕاستەی ئایینی مەسیحی و گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی بەسەردا هات. پۆلس هەر بە گەڕانەوەی دەستی کردە بانگەواز بۆ ئایینی نوێ. لێرەوە خەڵکی لێی بوون بە دوو بەشەوە:

ئەوانەی لەوەوپێش بەدەست ئازار و ئەشکەنجەی پۆلس و شوێنکەوتووانییەوە دەیاننالآند، دڵخۆش و ئاسوودە بوون چونکە ئەشکەنجەیان لەسەر هەڵگیرا و ئازاد بوون و بێ ترس بانگەوازی خۆیان دەکرد. ئەمەی تا دوێنی دوژمن و داپڵۆسێنەریان بوو، ئێستە بۆتە بانگخوازێکی گەورە. بەڵام ئەوانەی لەسەر عەقیدە و بیروباوەڕی دروست مابوونەوە، واقیان وڕ مابوو و پێیان سەیر بوو؛ ئەم پیاوە هەر بەوەندەی -بە گومانی خۆی- ئەم دیمەنەی لە ئاسمانەوە بینی، ئیتر دەستبەجێ و بێ سێ و دوو بووە مەسیحییەکی دڵسۆز و کەوتە بانگەواز و خەڵك کۆکردنەوە بۆی. بەڵام نەك بەو جۆرەی مەسیح لەسەری بووە، بەڵکوو بە جۆرێکی تر و لە بەرگێکی تردا! بانگەواز بۆ ئایینێکی تەواو جیاواز و سەربەخۆ لەوەی پێشوو، نە وەك ئەوەی ئەوان کە لەوەوپێش ناسیویانە و نە وەك ئەوەش لە ئینجیلەکاندا هەیە. بۆیە ئەم کارەی پۆلس بووە جێی دوودڵی و گومانی مەسیحییە ڕاستەقینەکان و کەوتنە گومان لێی و پەرچیان دایەوە و بەرهەڵستییان کرد. بەڵام لەبەر ئەوەی لەدواییدا دەوڵەت بیروڕاکانی (پۆلس)ی کردە بنەمای ئایینی فەرمیی وڵات، نەیانتوانی هیچ بەرهەڵستکارییەکی ڕاستەوخۆی بکەن و هەموویان تەفروتوونا کردن. ئیتر پۆلس دەستی کردە بەرنامە و پلاندانان و یاسا و دەستووری لە لای خۆیەوە دەردەکرد و خەڵکی دەنارد بۆ شوێن و لادێکان بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحییەتی نوێ و دەیگوت ئەمە دروستە و ئەمە نادروستە، ئەمە دەبێت و ئەمە نابێت. دەستی کردە ناردنی ئەو کەسانە کە لە ئینجیلدا ناوی بردوون بە نوێنەران (الرسل). ئەمی نارد بۆ حەبەشە، ئەو بۆ قوبرس، ئەوی تر بۆ ئەسکەندەرییە وهتد... بەم جۆرە دەستی کردە دانانی بانگەوازێکی نوێ بە شێوەیەکی سەرسام و سەرسوڕهێنەر و دوور لە ئایینی ڕاستەقینەی مەسیح!!

چۆن ئەمە ڕووی دا؟! لەکوێوە ئەم ئایینەی وەرگرت؟! لەکوێوە بۆی هات؟! بەم جۆرە جەنگ لەنێوان پۆلس و شوێنکەوتوانی ڕاستەقینەی مەسیحدا گەیشتە ئەوپەڕی.

پاشان ئیتر ئینجیلەکان نووسرانەوە. کۆنترین دەقی ئینجیلیش کە هەبێت لە ساڵی (٢٠٩ز)دا نووسراوە. لە کاتێکدا عیسا -سەلامی لێ بێت- لە تەمەنی ٣٣-ساڵیدا بێت و ڕەنگە لە ٤٠-ساڵیشدا بووبێت، بەرز کراوەتەوە -خواش زاناترە-.

گرنگ ئەوەیە کە لەپاش دووسەد ساڵ لە بەرزکردنەوەی مەسیح یەکەم ئینجیل نووسراوە. ئەویش بریتییە لە ژیاننامەیەك و نووسەرەکەی بینیویەتی و نووسیویەتییەوە؛ لەسەرەتاکەیدا دەڵێت: ئەی هاوڕێی خۆشەویستم (ساوفیلْد)، کاتێك بینیم خەڵکی لەوەی کە بیستوویانە سەبارەت بە وشە -واتە مەسیح- باس دەکەن، حەزم کرد منیش ئەوەی کە بینیومە و بیستوومە لەو خەڵکانەوە کە لەگەڵ مەسیحدا بوون و پێم گەیشتووە بۆتی بنووسمەوە. لێرەدا دانەری ئینجیل وەك ئەوە وایە بڵێت: "من مرۆڤێکم و ئەو شتانەی پێم گەیشتوون سەبارەت بە مەسیح دەیاننووسمەوە."، هەرگیز نەیوتووە: ئەمە کتێبی خوایە یان خوا هێناویەتییە خوارەوە. دەقی ئەمەش لە پێشەکی و سەرەتای ئینجیلدا هەیە.

ئیتر پاشان لە سەدەی سێیەمدا -واتە نزیکەی ساڵی (٣٠٠ز)- ئینجیلی یۆحەننا نووسرا، کە ترسناکترین ئینجیلە لە ڕووی بیروباوەڕەوە، چونکە بەڕاشکاوی دەقی لەسەر ئەوە هێناوە کە خوا سیانە! واتە دوای ئەوەی دەوڵەت بە فەرمی بیروباوەڕی (پۆلس)ی کردە ئایینی فەرمیی خۆی، ئینجیلی یۆحەنناش دانرا. ئەم ئینجیلە بە شێوەیەکی ڕەسمی شیرك و سێ-خوایی کردە عەقیدەی مەسیحی و لادان، بیدعە و گومڕایی بەتەواوی پەرەی سەند.

بەم پێیە ئەم ئایینە -وەك ڕۆژئاواییەکان خۆیان ناوی دەنێن- بووە ئایینێکی تێکهەڵکێش؛ عەقیدەی سێ-خوایی (التثلیث)ی لە ئەفلاتۆنیی نوێوە وەرگرت، مەسەلەی لەخاچدانیش کە یەکێك لەپێناو تاوانی کەسانی تردا لەخاچ بدرێت لە ئایینی مەسرائی کە ئایینێکی بتپەرستی کۆن بوو و پۆلس پێش ئەوەی ببێتە مەسیحی هەواداری ئەو ئایینە بوو، وەرگرت. هەروەها هەندێك شتیش لە بواری شەریعەت و یاسادا لە تەوراتە شێوێنراوەکەی جوولەکەشەوە وەرگرت. ئیتر بەم جۆرە ئایینێکی نوێ بووە مۆڵگەی تێکەڵکردنی کۆمەڵێك ئەفسانە و بیرۆکە و بیروڕای فەلسەفی و کوردگوتەنی وەك چێشتی مجێوری لێ هات. ئەم ئایینە بووە ئایینی فەرمیی دەوڵەت و بەڕەسمی ناسێنرا.

ئیتر ئەورووپا ئەم ئایینەی بەم بەرگەوە وەرگرت و مەسیحییەتەکەی پۆلس بووە سەرچاوەی ئایین لە ئەورووپادا.

بەم جۆرە ئەورووپای ئەو کاتە لە ئەفسانە و گومڕاییدا ون ببوو تا موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بەحەق نێردرا و -وەك دەزانین- نووسراوەکەی نارد بۆ (هەرقل)ی گەورەی ڕۆم و ئەم ئایەتی سوورەتی (آل عمران)ی تێدا نووسیبوو: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِنْ دُونِ

اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ [آل عمران: ٦٤]. [(ئەی موحەممەد صلی اللە علیە وسلم)، بڵێ: ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانە کراوە، وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەیەکەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لەنێوان ئێمە و ئێوەشدا (ئەویش ئەمەیە): جگە لە (اللە) کەسی تر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان نەکەینە فەرمانڕەوا و لەجیاتی ئەو زاتە نەیپەرستین. خۆ ئەگەر لەم بانگەوازەدا سەرپێچیان کرد و گوێیان پێ نەدا، ئەوە پێیان بڵێ کە ئێوە بە شایەت بن کە ئێمە موسڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین.]

وە خوای گەورە ئەم فەرموودەی دابەزاند: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ﴾ [التوبة: ٣١]. [(گاور و جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لەجیاتی خوا (ملکەچ و فەرمانبەرداریانن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ و حەرام دەکەن)، هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش (بە کوڕی خوا دەزانن).] هەروەها فەرموودەی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيراً مِنَ الْأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ [التوبة: ٣٤]. [ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، چاك بزانن کە زۆربەی حاخامەکانی جوو و قەشەکانی گاوران ماڵ و سامانی خەڵکی بەناحەق دەخۆن و بەرهەڵستیی ڕێباز و ئایینی خوا دەکەن. جا ئەوانەی کە ئاڵتون و زیو کۆ دەکەنەوە و قایمی دەکەن و لەپێناوی ڕێبازی خوادا و بۆ ڕەزامەندی ئەو نایبەخشن، ئەوە مژدەی سزایەکی پڕئێشیان بدەرێ.]

وە زۆرێك لە ئایەتەکان بەردەوام دادەبەزین، بەتایبەت لە سوورەتی (آل عمران)دا کە زیاتر لە هەشتا ئایەت سەبارەت بە گاورەکانی نەجران هاتنە خوارەوە، کە چارەسەری کێشە و مەسەلەی لادان و لەڕێدەرچوونی عەقیدە و بیروباوەڕی نەسرانییەکان دەکات و بانگەشەیان دەکات بۆ گەڕانەوە بۆ ڕێگەی حەق کە یەکخواپەرستییە.

کاتێکیش پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) بەحەق نێردرا، ئەورووپا لە تاریکاییی شیرك و ئەفسانەدا دەتلایەوە. چونکە ئایین و فەرمانی خوای ڕانەگرتبوو، ئایینێکی پڕئەفسانە و خورافە بنەمای بینش و تێڕوانینیان بوو لە خوا و بوونەوەر و مرۆڤ. مەسیحیان دەپەرست کە مرۆڤێك بووە و خوا دروستی کردووە، ئەحبار و ڕوهبان و قەشە و حاخامەکانیان دەپەرست و بەگوێی ئەوانیان دەکرد. شیرك و هاوەڵگیریی شوێنکەوتنیان هەبوو. شوێن دەستوور و یاسای ڕۆمانی دەکەوتن کە جوستنیان و کەسانی تر دایاننابوو. بەڵکوو لە هەموو کارەکانیاندا تەنانەت لە مەسەلەی ئەخلاقیاتیشدا هەر لە شیرکدا بوون. تەنانەت ئەخلاقیشیان لە عورف و نەریتەکان

یان لەوەی کە ئەحبار و ڕاهیبەکانیان لەلای خۆیانەوە بۆیان پەسەند دەکردن سەرچاوەی گرتبوو نەك لە ئایینەوە.

## بیدعەی گۆشەگیری (الرهبنة)

بیدعە و داهێنراوەکانی نێو ئایینی نەسرانی ئێجگار زۆرن. بەڵکوو ئایینەکە خۆی کۆی کۆمەڵێك بیدعە و داهێنراو و ناڕاستییە، بەڵام لەو بیدعە گەورە و کاریگەرانەی لەم ئایینەدا دروست بوون، بیدعەی گۆشەنشینی و گۆشەگیری بوو. خوای گەورە لە قورئاندا بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ [الحديد: ٢٧]. [وە ئەوان ڕەهبانییەت و دوورەپەرێزییان لە دنیادا کردە پیشەیان، وە نەبێت ئێمە ئەو حاڵەتەمان لەسەر فەرز کردبن، بەڵکوو تەنها بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوامان لێ داوا کردبوون، کەچی ئەوان ڕەهبانییەتیان بەچاکی پەیڕەو نەکرد، ئێمەش پاداشتی ئەوانەمان دایەوە کە باوەڕی ڕاست و دروستیان هەبوو. هەرچەندە زۆربەیان لارووێر و خوانەناس و یاخی دەرچوون.]

لێرەوە ئەم گۆشەگیرییە بە شێوەیەکی واقیعی و کردەیی دەبێتە جیاکەرەوە لەنێوان ئایین و واقیعی ژیان، لەنێوان دین و دنیا، مەسیحییەتی شێواو و گۆڕاو مرۆڤی خستە نێو دووڕیانێکەوە کە سێیەمی نەبێت: یان ئەوەتە بچێتە ناو مەلەکووتەوە و لە دەسەڵاتی خوایی نزیك بێتەوە، ئەو کات دەبێت بڕواتە دێر و کڵێساکان و بە شێوەیەکی  توند و دوور لە هەموو خۆشییەکانی ژیان دەست بکاتە عیبادەت و بەندایەتی. ئەم شوێنانەش کەسانێکی دڵڕەقی بێبەزەیی سەرپەرشتی دەکەن و بە ویست و ئارەزووی خۆیان چییان بوێت دایدەنێن و پێی دەڵێن و بەزۆر بەسەریدا دەسەپێنن؛ ئەمە بکە و ئەوە بکە، ڕۆژی ئەوەندە تەرخیمە و زیکر بکە، ئەوەندە فلانە شت بڵێرەوە، ئەوەندە بەپێوە بوەستە، ئەوەندە ئامادەی خوانی خوایی (العشاء الرباني) ببە وهتد...

زۆرێکی دیکەش لەم بیدعە و ئەفسانانەی خەڵکێکی زۆریان پێوە گیرخواردوو کردبوو.

لەملاشەوە هەرکەسێکیش دنیا و خۆشی و لەزەتی دنیای دەوێت، با لە مەلەکووتی خوا بچێتە دەرەوە، چونکە ژیانی دنیا و خۆشگوزەرانیی دنیا لەگەڵ ژیانی نزیك لە مەسیحدا پێك نایەنەوە. چونکە دەیەوێت ژن بێنێت کە مەسیح -سەلامی لێ بێت-

خۆی لێ بەدوور گرتووە، کارکێی نەفرەتلێکراوە و پیاوانی کەنیسە بەدوورن لێی، دەیەوێت زەوی بکێڵێت و بژێوی پەیدا بکات -کە خەڵکی ئەورووپا ئەو کاتە ئەوە پیشەیان بووە- ئەویش هەر کارێکی دنیایی بێئەرزشە و پێی لە مەلەکووتی ئاسمانەکان دوور دەکەوێتەوە. بەڵام ئەو کەسەی هەمیشە لە دێر و کەنیسەکاندایە و نایەتە دەرەوە، ئەوە دەرگای هەموو شتێکی بۆ دەکرێتەوە و دین و دنیاش مسۆگەر دەکات. ڕزق و ڕۆزی ڕووی تێ دەکات، بەخشین و دیاری و خێر و چاکە، پێویستی بە کەس نییە.

بەم شێوەیە کەنیسە ژیانی گۆشەگیری کردە ڕەوتێکی پیادەکراوی شوێنکەوتووانی و بەتەواوی عەقیدەی جەبری بەسەردا سەپاندن.

## ڕاوەستاویی ژیانی ئەورووپایی

بەدرێژاییی چەندەها سەدەی دوورودرێژ وەستان و جێگیری سەراپای ژیانی ئەورووپای داگیر کردبوو. هەموو شتێك لەجێی خۆیدا نەبزۆك و نەگۆڕاو بوو. خزمەتکار کاری بۆ چینی ئەشراف و خاوەن-پایە دەکرد، خاوەن پایەش ماڵ و سامان و بەندە و کۆیلەی پێکەوە دەنا. هەر لەم کۆیلە و خزمەتکارانە سوپای خاچپەرستان پێك هات، کە هێرشیان پێ کردنە سەر جیهانی ئیسلام. حاڵی کەنیسە جێگیر و نەگۆڕ بوو؛ پاپا و قەشەکان بۆ هەتاهەتایی نوێنەری خوا بوون و بە ناوی دینەوە بڕیاریان دەدا. دەرەبەگ و خاوەن-موڵك و زەوییەکانیش هەر بەو شێوە، ئیمپراتۆر و مەلیکەکانیش لە خواوە ئەو پایەیان پێ بەخشرابوو کەس بۆی نەبووە ململانێیان لەگەڵ بکات و تەنانەت ناڕەزاییش دەربڕێت. نەوە لەدوای نەوە ئەمەیان بۆ دەمایەوە. ئیتر بەم شێوەیە خاوەندەسەڵات و دەرەبەگ و کەنیسە لە سەرەوە بۆ خوارەوە هەموویان لە کارەکانی خۆیاندا بەردەوام بوون. ئەمیان لە دێرو کڵێساکەیدا، ئەویان لەسەر گێڵگە و موڵك و ماڵەکەی، ئەوی تریش لە دەسەڵات و فەرمانڕەواییەکەیدا وهتد...

خەڵکی هەژاریش بەشیان گوێڕایەڵی و ملکەچی نەبێت هیچی تر نەبوو.

چەند سەدەیەك بەسەر ئەورووپادا ڕابورد و ژیان بەم شێوەیە ڕاوەستاو بوو. لەوەش تاریکتر ئەوە بوو کە ئەو گەلانەی ناو دەبران بە نۆرماندییەکان -گەلانی سەروو- کە هەموویان گەلانێکی بێسەروبەر و هەرچیوپەرچی و مشەخۆر بوون، هاتن و ڕۆمایان داگیر کرد؛ واتە کەنیسەی ڕۆژئاوایان داگیرکرد و هەڵیانوەشاندەوە.

کەنیسەی ڕۆژهەڵات کە قوستەنتینییە بوو لەسەر نەسرانییەتی خۆی مایەوە، بەڵام کەنیسەی ڕۆژئاوا کە وڵاتەکانی وەك ئیتالیا، فەرەنسا، ئەڵمانیا و بریتانیا بوون، چەند سەدەیەکی درێژخایەن بێ نووسین و خوێندن و زانست بەم شێوەیە مانەوە. هەموو سەرمایەکەیان لە علیم و زانست و خوێندەواری چەند کتێبێك بوون کە پێش هاتن و هێرشی نۆرماندییەکان بۆ سەر ڕۆما نووسرابوون. تەنها هەندێك لە باوکان (کاردینالّەکان) دەیانخوێندنەوە و ئەوانی تر بەتەوای مایەوپوچ و بێزانست بوون.

ئەورووپاییەکان فەتحی قوستەنتینییە بە سەرەتای دەستپێکردنی مێژووی نوێ لەقەڵەم دەدەن، بۆچی؟!

ئایا وەك ئیعتیبارێك بۆ ئێمە کە فەتحی قوستەنتینییەمان کرد؟!

نەخێر، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە ئەوان دەڵێن کاتێك موسڵمانەکان قوستەنتینییەیان ڕزگار کرد، سوڵتان موحەممەد فاتیح، ئەمان و سەلامەتی دا بە نەسرانییەکانی ئەوێ. هەرچەند قوستەنتینییە لەلایەن موسڵمانەکانیشەوە ڕزگار کرا، بەڵام نەسرانییەکانی ڕۆژئاوا دڵخۆش بوون، چونکە دەرگای ئاڵۆگۆڕکردنی عیلم و زانست لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا کرایەوە، کە ئەمە بووە سەرهەڵدانی شارستانییەت لە ئەورووپادا و بووە وەرچەرخانێکی مێژوویی زۆر گرنگ لە ڕەوتی ڕاپەڕین و سەرهەڵدانی ناکۆکیی نێوان کەنیسە و نەیارانیدا.

مەسەلەیەکی دیکەش جێگۆڕکێ و گواستنەوەی ژیاری ئیسلامییە بۆ ئەورووپا لەڕێی ئەندەلووس و ئیتالیاوە، زانکۆکانی ئەو کاتەی ئیتالیا زمانی عەرەبییان تێدا دەخوێندرا. تەنانەت گەورەترین ئیمپراتۆری ئەورووپایی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کە فریدریکی دووەم بوو کاتێك هات بۆ فەلەستین و لەگەڵ ئەمیر کامل ئەییووبی چاوپێکەوتنیان کرد، بە جۆرێك زمانی عەرەبی دەزانی کە پێویستیان بە وەرگێڕ نەبوو لەنێوانیاندا. لەو کاتەدا زمانی عەرەبی زمانی عیلم و زانست و ئاخافتن بوو. هەر ڕۆشنبیرێك دەبوو زمانی عەرەبی بزانێت ئەگینا پێی نەدەگوترا ڕۆشنبیر. بەم جۆرە خوارووی ئیتالیا بووە بنکەیەك بۆ گوێزانەوەی ژیار و شارستانێتیی ئیسلامی ڕوو بە ئەورووپا.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەورووپا دان بەمانەدا نانێت. گرنگیش نییە بەلامانەوە دانی پێدا بنێت یان نا، ئەمە شتێکی سروشتی و بەڵگەنەویستە، بەڵام ئەوەی جێی تێڕامان و سەرسامییە ئەوەیە کە ئیسلام بە شارستانێتییەکی تەواو ڕوو بە ئەورووپا هات، بە سامان و کەلەپوورێکی تەواوەوە. بەڵام لە هەموو ئەمانە یەکێکیان هەڵبژارد کە بە

گەورەترین و کاریگەرترین کەسایەتی دەزانن لە کەسانی جگە لە ئەورووپایی، ئەویش (ئیبنڕوشد)ی حەفیدە، کە ناوی دەبەن بە (ئاڤیرۆئیس **Averroes**). چۆن لای ئەوان ئەو پلەیەی نابێت و ئەو سەنگەی بۆ دانانێن، لە کاتێکدا هەموو کتێبەکانی ئەرستۆی وەرگێڕاوە و ئەورووپا لەوەوە لە فەلسەفە و بینشی ئەرستۆ گەیشتن!!! هەر بۆیەش لای ئەورووپاییەکان (ئەرستۆ) مامۆستای یەکەمە و (ئیبنڕوشد)یش دووەم.

لێرەوە ئەوەی پێی دەڵێن زانیارییە مرۆییەکان (العلوم الإنسانية) دەستی پێ کرد. جێی داخە کە ئێمەش هەمان ناوەکانی ئەوان دەڵێینەوە، بۆیەش ناوی عیلمی بەسەردا بڕا، چونکە ئەو کاتە زانست لە دانانی پیاوانی ئایینی بوو. کەنیسە و پیاوانی ئایینی پاڵەپەستۆیان ئەخستە سەر زاناکان، فەرمانیان بەسەر هەموو شتێکدا دەدا. علیم و زانست هەر ئەوە بوو کە پیاوی ئایینی و کەنیسە دەیڵێت، جا باس باسی زەوی بوایە یان گەردوون و بوونەوەر یان تەشریع و یاسا و بەرنامە؛ وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ [التوبة: ٣١]. هەرچییەك کابرای کاهین و قەشە دەیگوت، ئەوە هەم دین و هەم زانستیش بوو.

بەڵام ئەوانەی هەڵگەڕانەوە و بەرەو هزر و نەفامیی یۆنانی هەنگاویان نا، هزری مرۆییان وەك بەرامبەرێك بۆ هزر یان زانیاریی لاهووتی دانا و پیادەیان کرد و وتیان: ئەمە بیر و هزرێکی مرۆییە، پەیوەندیی بە کەنیسە و پیاوانی دینەوە نییە، کە دائەبڕێت بەسەر زانستی کۆمەڵناسی و زانستی دەروونناسیدا. واتە چونکە تاکە سەرچاوە کە بە ناوی ئایین و خواوە قسە و لێدوان بدات، پیاوانی دینشێواوی کەنیسە بوون، ئەمانیش بۆ ڕاکردن لەو واقیعە و دانانی بنەمایەکی نوێی جیاواز لە کەنیسە، ئەم زانستانەیان ناو نا زانستە مرۆییەکان.

ئەم زانستانەش –هەتا ئێستەش- ئێمە زۆرێکیمان لێ وەرگرتووە و دەیخوێنین، لە زۆربەیاندا کۆمەڵە تێورێکن دژ و پێچەوانەن لەگەڵ ئیسلامدا. جێی داخە کە زۆر بە کەمیش دەبینین کەسانی نووسەر و تایبەتمەند لەم بوارانەدا لە دید و بۆچوونێکی ئیسلامییانەوە لەم بابەتە بنووسن و لێی بکۆڵنەوە.

ئیتر ئەوەی ناو دەبرێت بە چاخی ڕاپەڕین دەستی پێ کرد و کێشە و ململانێ لەنێوان ئایین و هزری مرۆییدا دەستی پێ کرد وەك وا ناوزەدەی دەکەن.

## تێکگیران لەنێوان کەنیسە و زانستدا

دێینە سەر قۆناغێکی تر ئەویش قۆناغی زانستی ئەزموونی (العلم التجريبي)یە، کە زانایانی ئەورووپا لە موسڵمانەکانەوە لێی بەهرەمەند ببوون. دەستیان کردە تێڕوانین و وردبوونەوەی بوونەوەر بە شێوەی ئەزموون و تەجرەبە. لێرەدا پێویستە خاڵێك ڕوون بکەینەوە ئەویش لە حیکمەت و تەقدیری خوای گەورە وا بوو تێکگیران و ململانێی نێوان کەنیسە و زاناکان لە تێورە گەردوونی و سروشتییەکان پێش تێور و نەزەرییە مرۆییەکان بکەون.

بواری تێورە بوونەوەرییەکان لۆژیك و ژیربێژییە. خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ﴾** [يونس: ١٠١]، **﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ﴾** [الأنعام: ١١]. ئایەتی دیکەش لەم بابەتە زۆرن.

تێڕوانین و بیرکردنەوە لە بوونەوەر لە کاری مرۆڤ و عەقڵ و ژیریی مرۆڤە، بەڵام تێڕوانین لە مرۆڤ و دەروونی مرۆڤ و حاڵەتی کۆمەڵایەتی و دەستوور و یاسای نێو مرۆڤەکان، ئەمەیان لەکاری مرۆڤ خۆی نییە. جا تەقدیری خوا وا بوو کە یەکەم تێکگیران و پێکدادانێك لەگەڵ ئەفسانە و خورافاتی نەسرانییەتدا لە بواری تێور و نەزەرییەکانی بوونەوەر بێت. جا کاتێك لەمەدا زانایان زاڵ بوون بەسەر کەنیسەدا -چونکە خاوەنی حەق بوون-، ئەوەی تر زۆر ئاسان بوو سەرکەوتن و زاڵبوون لە بوارەکەی تردا -کە خاوەن حەق نەبوون تێیدا-. ئەوەبوو ئەزموونە زانستییەکان وردەوردە دەرکەوتن و سەریان هەڵدا تا (گالیلۆ **Galilei**) هات و قسەیەکی کرد کە لە پێوەری زانستدا شتێکی وا گەورە نییە، بەڵام لە ڕوانگەی کەنیسەوە زۆر قورس و گران بوو؛ هەرایەکی گەورەی نایەوە و بووە هۆی ئەوەی پاپا فەرمانی بێباوەڕبوونی گالیلۆ دەرکات و فەرمان بدات کەس نە بیدوێنێت و نە لەناو کۆمەڵدا جێی بێتەوە. تا وای لێ هات ئەوەندە تەنگی پێ هەڵچنرا، بەناچاری چووە بەردەمی پاپا و پاڕایەوە تا لێی خۆش بێت. جا ئایا ئەو قسەیە چی بوو کە ئەم هەرا گەورەی نایەوە و درزێکی لە دیواری پتەوی کەنیسە کرد؟

گالیلۆ وتی: "زەوی دەسووڕێتەوە." ئەمە کە هیچ شتێکی پێچەوانە بە ئایینی ڕاستی تێدا نییە، کەنیسە وەك هەرتەقەیەك سەیری کرد و فەرمانی پێچەوانەوەی دا.

تاکوو جیاوازی نێوان خودی بیردۆزەکە -ڕاست بێت یان ناڕاست- لە ئیسلام و ئایینەکەی ئەواندا دەرکەوێت، دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین کە ئەگەر ئایینێك لەسەر ئەفسانە دامەزرابوو، هەر کاتێك ئەفسانەکە ڕووخا و نەما، بەڵگەنەویستە

کە ئایینەکەش لەق دەبێت و متمانە و پێگەی لە دڵی هەڵگرانیدا نامێنێت. لەبەر ئەوە هەڵگران و هەوادارانی ئەو ئایینە ئەفسووناوییە، بەوپەڕی توانا و تا کۆتایین هەنگاو بەرگری لەو ئایینە دەکەن و جەختی لەسەر دەکەنەوە، بەحەق و بەناحەق نەیاران و ناحەزانی ئەو ئەفسانەیە دەدەنە بەر تۆمەت و لێپێچانەوە.

بەڵام لە ئیسلامدا مەسەلەکە تەواو پێچەوانەیە. ئایینی خوا دەستی مرۆڤی نەگەیشتووەتێ و دوورە لە گۆڕانکاری و شێواندنی مرۆڤ، دوورە لە قسە و بیروڕا و بۆچوونی مرۆڤ، نیگایەکی خواییە و پاك و خاوێن و بێگەرد ماوەتەوە: ﴿قُلْ إِنَّمَا أُنْذِرُكُمْ بِالْوَحْيِ﴾ [الأنبياء: ٤٥]. لایەنی زانستی و مرۆیی تێدا بەجێ هێڵراوە بۆ مرۆڤ، با مرۆڤەکان خۆیان هەڵە بکەن کاتێك بە نموونە دەڵێن: دەخولێتەوە، یان دەڵێن: ناخولێتەوە. ئەمە هیچ گرفت و کێشەیەك لەگەڵ ئاییندا ناخوڵقێنێت؛ خوا کە دروستکەری مرۆڤە و بەدیهێنەری بوونەوەرە و دابەزێنەری وەحییە، نابێت شتێك بفەرموێت لەگەڵ کار و کردارەکانیدا پێك نەیەتەوە. لەبەر ئەوە لە قورئاندا داوا لە مرۆڤ کراوە کە بڕوانێتە ئەم بوونەوەرە و بەسەر زەویدا بگەڕێت تا شێواز و یاسا و دەستووری ئەو بوونەوەرەی بۆ ڕوون بێتەوە.

بەڵام پیاوانی کەنیسە هەستیان کرد کە تەنها بیردۆزێك یا نەزەریەیەکیش بەسە بۆ ڕووخاندن و پێلەقبوونیان. ئەگەر لەو بازنەیە دەرچێت کە ئەوان بۆیان بڕیار داوە، ئەمە دەبێتە سەرەتایەك بۆ دەرچوون و ملنەدان بۆ کەنیسە. جا ئەگەر ئێستە بستێك دەرچێت، پاش ماوەیەك دەبێتە باڵێك و پاشان بەتەواوی لەژێر دەسەڵاتی کەنیسە دەردەچن، کە ئەمە هەروا بوو پێشبینییان دەکرد و ڕووی دا. جا لێرەوە دەستیان کردە سزادان و ئەشکەنجەدانی گالیلۆ، تا وایان لێ کرد لە قسەکانی پەشیمان بێتەوە و لە کۆتاییشدا هەر کوشتیان.

پاشان یەکێکی تر هات و ڕۆڵێکی گەورەتری لە ململانێکەدا گێڕا و زەنگێکی ترسناکتری دا بە ڕووی کەنیسەدا. ئەویش (کۆپێرنیك **Copernicus**) بوو؛ کۆپێرنیك وتی: "چەقی بوونەوەر بریتییە لە ڕۆژ و زەویش دەخولێتەوە. زەوی هەسارەیەکە پاشکۆ و شوێنکەوتەی ڕۆژە." کۆپێرنیك کتێبی کۆن و کتێبی زانایانی موسڵمانی خوێندبۆوە کە باسیان لە قەوارەی ڕۆژ کردبوو کە لە زەوی گەورەترە -کە ئەمە شتێکی زانراو و بەڵگەنەویستە و ئێرە بواری باسکردنی نییە-، گرنگ ئەوەیە کاتێك کۆپێرنیك ئەم ڕاستییەی خستە ڕوو، قەشە و گەورەکانی کەنیسە وتیان باشە ئەگەر وتمان زەوی خڕە و دەخولێتەوە، ئەوە ئەو مرۆڤانەی لە بەشەکەی تری گۆی زەین دەبێت قاچیان بەئاسمانەوە بێت و لەسەر سەر بڕۆن؛ ئەمەش بیرۆکەیەکی شەیتانییە و بە هیچ شێوەیەك ناکرێت ڕاست بێت.

ئەوەی جێی سەرسامییە ئەوەیە کە کۆپێرنیك بۆ خۆی قەشە بوو! هەروەها کە تێبینی دەکرێت پاڵەوان و دەرکەوتووانی ئەورووپا لە بوارەکانی هزر و بیردا لەو سەردەمەدا زۆربەیان یان قەشە بوون یان کوڕانی قەشەکان بوون. ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە کەنیسە دەستی گرتبوو بەسەر هەموو جومگەیەکی ژیانی ئەورووپادا لەوانەش بوارەکانی خوێندن و نووسین. هیچکەسێك بۆی نەبووە لەدەرەوەی کەنیسە فێری شتێك لە زانست و زانیاری ببێت، بۆیە دەبینین خوێندەوارەکان گشتیان لە دێر و کەنیسەکانەوە پەیدا دەبوون.

ئینجا ئەمیشیان بە هەمان دەردی گالیلۆ برد و هێنایان و وتیان ئەمە سەرپێچیی فەرمانی خوای کردووە و بیرۆکەی شەیتانی مێشکی ئاخنیوە. کەوتنە هەڕەشەلێکردن و ئەشکەنجەدانی، تاکوو لە کۆتاییدا و لەژێر پاڵەپەستۆی زەبروزەنگ و لێداندا دانی نا بەوەی کە بەڵێ ئەمانە هەموو شەیتان نیگای بۆ کردووە و خستوویەتییە مێشکییەوە. شەیتان –نەفرەتی لێ بێت- پێی وتووە کە ڕۆژ چەقی بوونەوەرە و زەوی دەخولێتەوە وهتد...

کۆپێرنیك لەژێر ئەشکەنجەدا دانی نا بەوەدا کە هەمووی ئەمانەی وتوویەتی و نووسیویەتی هەمووی فیتی شەیتان بووە و ئامادەی پەشیمانبوونەوەیە لەوەی کە نووسیویەتی! ئیتر کەنیسە بە تاوان و تۆمەتی دەرچوون لە فەرمانی خوا دادگاییان کرد و لە کاتی دادگاییکردنەکەیدا زۆریان بۆ هێنا کە بڵێت شەیتان لە خەودا هاتۆتە لای و نیگای بۆ کردووە کە وا بڵێت و ئەوە ئێستە ئامادەیە تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ باوەشی دین و ئیمان!

جا ئەمە قۆناغێکی گرنگ بوو لە عەقڵ و ژیریی ئەورووپاییدا بەرامبەر بە جەهل و ئەفسانەی پیاوانی کەنیسە. پاشان ئیتر قۆناغ بەدوای قۆناغدا هات و کارەکە زیاتر تەشەنەی کرد و دیواری نێوان کەنیسە و زانست ئەستوورتر بوو، تا لە کۆتاییدا کەنیسە چۆکی دادا و پاشەکشەی کرد. چونکە ئەفسانە و درۆ ناتوانێت تاسەر بەردەوام بێت و خۆی بگرێت.

کتێبەکەی کۆپێرنیك تاکوو ئێستەش هەر ماوە و لەئاست سەردەمی خۆیدا کتێبی زانستی و بەهەندە.

دوای کۆپێرنیك کەسێکی تر هات و تیۆرییەکی زۆر سادە و زانستییانەی دۆزییەوە، کە (نیوتن **Newton**) بوو. نیوتن بیردۆزێکی سادە و ساکاری دانا کە تیۆریی کێشەهێزە (الجاذبية)، کە ساکار و سادەیە لای هەمووان و زانراوە؛ پوختەکەی

ئەوەیە کە هەموو هەسارە و تەنەکانی بوونەوەر بەهۆی کێشەهێزەوە بەیەکەوە بەستراون و یەکیانگرتووە. جا بیردۆزێکی لەم جۆرە هیچ گرفت و کێشەیەکی تێدا نییە و هیچ دژ و پێچەوانەی ئایین نییە. بیرکردنەوەیە لە یاسا و ڕێساکانی بوونەوەر و دۆزینەوەی پەیڕەوی دامەزراوی بوونەوەرە. بیردۆزەکەی نیوتن بیردۆزێکی زانستی و ژیرانەیە و زادەی بیر و وردبوونەوەی مرۆڤە لەو یاسا و ڕژێمەی ئەم گەردوونەی لەسەر ڕاگیراوە، بەڵام کەنیسە وەك کردەی هەمیشەجاری بیردۆزەکەی نیوتنی زۆر بە گەورەتر و مەترسیدارتر بینی لە بیردۆزی کۆپێرنیك و لە هەموو ئەورووپادا بڵاو کراوە و نامەیان ئاراستەی هەموو شوێنێك کرد کە ئەم کەسە نیوتن کافر و بێباوەڕ بووە و لەدین چۆتە دەرەوە وهتد... لە کاتێکدا نیوتن بەئاشکرا هاواری دەکرد و دەیگوت: "خەڵکینە من باوەڕم بە خوا هەیە و ئەمەی من دەیڵێم هیچ دژ و پێچەوانەییەکی نییە لەگەڵ ئیماندا." لەڕاستتشدا هەر وا بوو. نیوتن ئەوەی خستە ڕوو کە ئەم گەردوونە لەژێر یاسایەکی میکانیکی بێوێنە و سەرسامدا دەڕوات، کە ئەگەر ورد تێی بڕوانیت، گەورەیی و دەسەڵات و دانایی خوای گەورەی تێدا دەبینییەوە نەك دژ و پێچەوانە بێت بە دین.

بەم شێوەیە کەنیسە جەنگێکی بێبەزەییانە لەگەڵ هەموو ئەزموون و تیۆر و ڕاستییەکی زانستیدا دەکرد، لە کاتێکدا خۆی لە هەندێك خورافە و ئەفسانە زیاتر هیچی تری پێ نەبوو. بۆیە ڕۆژ بەدوای ڕۆژ پێگە و دەسەڵاتی کەنیسە ڕوو بە لاوازی و خۆخواردنەوە دەهات تا بەرپابوونی یەکەم شۆڕشی عەلمانی لە فەرەنسا ڕووی دا.

## قۆستنەوەی جوولەکە بۆ ململانێی نێوان کەنیسە و زانست

هەندێ کەس –کە جوولەکە بوون- لەمێژەوە چاوەڕوانی هەل و دەرفەتێك بوون تۆڵەی خۆیان لە کەنیسە بکەنەوە و ئەم بۆشایی و ململانێی نێوان کەنیسە و زاناکان بۆ مەبەستی خۆیان بقۆزنەوە و سوودی لێ بکەن. لە ئەنجامی تیۆرەکەی نیوتنەوە چەند نەزەریە و تیۆرێکی دیکە پەیدا بوون کە دەیانگوت ئایا ناکرێ و ناگونجێ لە بەرامبەر ئەم نیزامە میکانیکییەی لەم گەردوونەدا هەیە، نیزامێکی میکانیکی مرۆییش هەبێت؟ بەپێی هەر زانستێك یان هەر تیۆرێك بێت؟! بە جۆرێك ئیتر مرۆڤ پێویستی بەوە نەبێت ڕوو بکاتە ئایین و لەوێوە ژیانی ئاراستە بکات؟!

ئەم مەسەلەیە زۆرێك لەو زانا و بیرمەندانەی سەرقاڵ کردبوو کە لەژێر تیر و دەسەڵاتی کەنیسە ڕایان کردبوو. سەرەتا هێرشکردنە سەر ئایین شێوازێکی ناڕاستەوخۆی گرتە بەر بە هێرشکردنە سەر پیاوانی ئایینی. چونکە لەو کاتەدا

نەیاندەتوانی و بوار گونجاو نەبوو ڕاستەوخۆ هێرش بکەنە سەر خودی ئایین خۆی، یان ڕاستەوخۆ ڕەخنە لە ئینجیل بگرن و هێرشی بکەنە سەر.

زانراویشە لە ئەدەبی ئەوروپاییدا کە چیرۆك و کارە ئەدەبییەکان لە دوو تەوەرەدا بابەتەکانیان دەخولایەوە:

تەوەرەی یەکەم: وێنەی پیاوێکی ئایینی کە لە بەرگی کەسێکی دیندار و ملکەچ بۆ خوا لە دێر و کەنیسەکاندا دەگری و ئینجیل دەخوێنێتەوە. بەڵام هەر هەمان ئەم ملکەچ و خواناسە هەر بواری بۆ ڕەخسا و بەنهێنی هیچ سڵ ناکاتەوە لە کاری فاحیشە. لەگەڵ ئافرەتە گۆشەنشینەکانی ناو کەنیسەدا زینا دەکات، سوو دەخوات، کاری خراپ و بێئاکام دەکات. بەم جۆرە بابەتە ئەدەبییەکان  گوزارشیان لەو حاڵەتە دەکردەوە. خەڵکیش بەگشتی کتێب و بابەتی ئەدەبی دەخوێننەوە، چونکە ئەدەب گوزارش لە ناواخن و ویستی مرۆڤەکان دەکات و واقیع دەخاتە پێش چاو. ئینجا لێرەدا ئەم چیرۆك و بابەتانە وردەوردە کاردانەوەیەکی پێچەوانە لە بیر و هۆش و شعووری خەڵکەکەدا بەرامبەر بە ئایین و پیاوانی ئایینی دەخولقێنێت. بەڵام سەرەتا لەڕێگەی هێرشکردنە سەر پیاوانی ئایینی و ناشرینکردنیان، تا لەوێوە ئیتر هێرش بۆ سەر خودی ئایین و بنەماکانی ئاسانتر بێت.

تەوەرەی دووەم: سۆز و عەتف و خۆشەویستی بۆ داوێنپیس و فاحیشەچییان! ئەمە وەك کارێکی ئاسایی و ناسراو لە ئەدەبی ئەوروپاییدا ڕەنگی دەدایەوە. کۆمەڵێك کاری ئەدەبی زۆر ناسراو هەن لەو سەردەمەدا کە باس لە ئافرەتێك دەکەن، کە بەهۆی باری ناهەموار و بارودۆخی خراپی کۆمەڵگا یان نەبوونی و کەمدەستییەوە، سەری کردۆتە سەر لاشەفرۆشی و فاحیشە. ئەم ئافرەتە هەرچەندە داوێنپیسە و شەرەف و داوێنی خۆی ئازاد کردووە بۆ هەرکەسێك شتێکی بداتێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەتێکی بەڕێزە، چونکە دزی ناکات، ئەخلاق و مامەڵەی لەگەڵ خەڵکیدا چاکە، وایە و وایە وهتد...

جا وێنەی ئەم ئافرەتە لەگەڵ وێنەی قەشە و کاردینالەکاندا بەیەکەوە باسیان لێوە دەکرا کە ئەمیان لەبەر هەر هۆیەکی ماددی و یان حەزێکی تایبەت خۆی داوێنی خۆی دەفرۆشێت، ئەوانیش بە ناوی ئایینەوە لە کەنیسە و شوێنەکانی خۆیاندا بەدزییەوە کاری فاحیشە و زینا و هەموو کارێکی ناشیرین ئەنجام دەدەن!

کە شەڕی نێوان کاتۆلیك و پرۆتستانت لە ئەوروپادا سەری هەڵدا، پرۆتستانەکان کاتێك زاڵ بوونایە بەسەر کاتۆلیکەکاندا، دەچوون گل و خۆڵی ناو حەوشی

کەنیسەکانیان هەڵدەدایەوە و ئێسکوپروسکی منداڵانی ساوا کە لە ئەنجامی زینای نێوان قەشەکان و ڕاهیبەکان لەدایك ببوون و پاشان هەر بەزیندوویی لەچاڵیان نابوون، دەریان دەهێنان و پیشانی خەڵکیان دەدا. ئەویش بۆ ئەوە بوو تاکوو بە خەڵکەکە بڵێن ئەوەتا کاتۆلیکەکان لایانداوە و ئەمان ڕاستن. وەك ئەوەی ئەوان لەڕێ دەرنەچووبن!

جا عەتف و بەزەیی هاتنەوە بە ئافرەتانی داوێنپیس و بەرەڵاکان ئاراستەیەکی ئەدەبی ئەو قۆناغەی ئەو کاتە بوو، کە کارەکانی (دیدرۆ **Diderot**)ی فەرەنسایی لە بەناوبانگترین کارە ئەدەبییەکانی ئەو سەردەمەیەوە ئەم پیاوە کتێبی زانینکۆ (دائرة المعارف)ی نووسی تاکوو شوێنی ئینجیل بگرێتەوە.

ئەم دیدرۆیە چیرۆکێکی زۆر گەورەی هەیە ناوی (الراهبة)یە. پاشان ناو نرا (المتدينة).

مەبەست ئەوەیە کە لەگەڵ ئاراستە زانستییەکەی ئەو سەردەمەدا کە دژ و پێچەوانە بە کەنسە هەنگاوی دەنا، ئاراستەیەکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتیش شانبەشانی ئەم لە ململانێی دژ بە کەنیسە ڕۆڵی خۆی دەبینی. بەم شێوەیە ئەم ململانێیە بەردەوام بوو هەتا هەردوو شۆڕشەکە هاتن و ئەوروپایان گرتەوە: شۆڕشی فەرەنسا کە بە مانای دروست شۆڕش بوو، هەروەها شۆڕشی پیشەسازیش کە شۆڕشێك بوو ئەورووپای لە قۆناغێکەوە بەرەو قۆناغێکی تر گواستەوە.

## ئاشکراکرنی عەلمانییەت بەڕەسمی

شۆڕشی پیشەسازی گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی گەورە بوو. لەگەڵ پەیدابوون و بەکارهێنانی ئامێردا سەری هەڵدا. پاشان سەری کێشا بۆ گۆڕانکاری و لەبێژنگدانی زۆر گەورە لە مێژووی ئەورووپادا. ئەم گۆڕانکاری و ترازان و بزاوتنە وای کرد ئەو بیرۆکانەی لە ڕابوردوودا زانست بانگەشەی بۆ دەکردن سەر بگرن.

شۆڕشی فەرەنسا بووە هۆی سەرهەڵدانی یەکەم شۆڕشی عەلمانی بە پێناسەی چەمکی هاوچەرخ بۆ عەلمانییەت، ئەگینا شیرك و هاوەڵگیری و بێباوەڕی هەر لە سەردەمی (نووح)ەوە لەناو مرۆڤدا هەبووە. بەڵام بەو چەمکەی ئەمڕۆ دەگوترێتەوە یەکەم دەوڵەتی عەلمانی لە فەرەنسا بوو ئەویش لە ئەنجامی شۆڕشی فەرەنسەدا دروست بوو.

جەماوەر هەموو بەیەکجار ڕژانە سەر جادەکان و هاواریان دەکرد و ئەمە دروشمیان بوو: (کۆتایین پاشا بە ڕیخۆڵەی کۆتایین قەشە هەڵبواسن!) ئەمەش گوزارش بوو لەو زوڵم و ستەمەی هەردووك لە پاشا و قەشەکان بەرامبەر بە میللەت دەیانکرد. هەردووکیان وەکیەك تاوانبار و چەوسێنەر و داپڵۆسێنەر بوون. تەنانەت پیاوانی ئایینی لە پاشا و مەلیکەکانیش توندوتیژتر و داپڵۆسێنەرتر بوون بۆ میللەتەکە. دەسەڵاتیان لەوان زیاتر بوو. لە مێژووی ئەورووپادا زۆرێك لەو ڕووداوانە خراونەتە ڕوو کە جاری وا بووە مەلیك و دەسەڵاتدارەکان بەملکەچییەوە چوونەتە بەردەرگای پاپا و داوای لێبوردنیان لێ کردووە. چەندەها شەو و ڕۆژ بەڕێوە بوون، کاتێك گەیشتوون لە کاتی سەرمای بەهێزدا لە دەرەوە وەستاون تا بە دیداری پاپا بگەن و داوای لێبوردنی لێ بکەن و لێیان خۆش بێت!

بەم شێوەیە کەنیسە ئایینی خەڵکی گۆڕی و پڕی کرد لە بیدعە و کاری داهێنراو و زوڵم و ستەم. لەڕاستیدا مێژوو شەرم دەکات باس لە زوڵم و ستەمی قەشەکان لەو سەردەمەدا بکات. پاپا بە ئارەزووی خۆی شتی کەم و زیاد دەکرد؛ حەڵاڵ و حەرام بەدەستی خۆی بوو. پاشاکانی دەگۆڕی، زانایانی دەگرت و دەسووتاند، سەرانە و دەیەکی لە بەروبووم و دانەوێڵە و ئاژەڵ لە خەڵکی دەستاند و بگرە زیاتریش. هەر لە دنیادا بەهەشتی قۆرخ کردبوو و دەیفرۆشت بە کەسانی دەسەڵاتدار و خاوەنسامانەکان. هەژارەکانیش جێگەیان دۆزەخی هەتاهەتایی بوو. دەتوانین بڵێین هەرچییەك کاری ناڕەوایی و بەدڕەوشتی هەبوو پیاوانی ئایینی دەیانکرد. بەتەواوی مانای ژیانیان نەهێشت و وێرانیان کرد. جا کاتێك شۆڕشی فەرەنسا سەری هەڵدا و کڵپەی کرد، بۆ یەکەم جار خەڵکی لەژێر پەستانی سێکوچکەی پاشا و دەرەبەگ و کەنیسەدا ڕزگاریان بوو؛ هەناسەی ئازادیان مژی، ئیعلانیان کرد کە دەوڵەتێکی بێئایینە و مرۆڤەکان هەموو تێیدا یەکسانن. نە ئایین و نە جگە ئایینیش جیایان ناکاتەوە، لەمەشدا جوولەکە لە هەموو کەسێك زیاتر قازانجیان کرد و بردیانەوە.

لای پیاوانی ئایینی هەرچییەك پێچەوانەی وەحی بوایە، ئەفسانە و خورافە بوو. لێرەوە بیردۆزی پەیدابوونی (داروین **Darwin**) لە ئەنجامی بیردۆزەکەی نیوتندا پەیدا بوو. نیوتن بیردۆزێکی میکانیکی بۆ بوونەوەر خستە ڕوو، جا ئایا دەتوانین وەك ئەوەی نیوتن بیردۆزێکی میکانیکیش بۆ مرۆڤ دابنێین؟ لەوانەیە یەکێك بڵێیت نیوتن تەنها تەفسیر و لێکدانەوەی بۆ چۆنێتیی پێکەوەبەستنی تەنەکانی گەردوون کردووە. وە هیچ ڕێگرێکیش نییە لەوەی کە ئەم تەنانەی بەم شێوە ڕێك خستووە و یاسای بۆ داناون کە خوا بێت، لەبەر ئەوە بیردۆزەکەی داروین گەورەترین گورزی

کوشندەی لە کەنیسە وەشاند، کە تا ئێستەش هەڵنەساوەتەوە، کە مەبەست و ناواخنی بیردۆزی داروینیزم بریتییە لەوەی کە مرۆڤیش وەك هەموو ئاژەڵەکانی دیکە ئاژەڵێکە و هیچ جیاوازییەکی نییە و خوا (الله) هیچ دەستێکی نییە لە کاری گەشەکردن و پەرەسەندندا و داروین -بە گومانی خۆی- بیردۆزێکی میکانیکی بۆ بنچینەی جۆرەکان دانا و گێڕانییەوە سەر یەك شت.

دێینە سەر مەسەلەیەکی گرنگ، ئەویش ئەوەیە کە لە ئیسلامدا، ئادەم -سەلامی لێ بێت- یەکەمین دروستکراوە و هەموو پێغەمبەران لە پشت و نەوەی ئەون. ئەم بابەتەش هیچ کێشە و گرفتێکی تێدا نییە، بەڵام لای کەنیسە ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگ و ترسناکە، بۆ؟ چونکە ئایینی نەسرانییەت تەنها لە مەسەلەی هەڵواسین و قوربانیبوونە کە تاوانەکەی ئادەم خوڵقاندوویەتی، تاوانەکەش ئەوەیە کە لە دارەکەی خواردووە. بەڵام خوا -خوا بەرز و بانترە لەوەی ئەوان دەیڵێن- کوڕەتاقانەکەی خۆی دەکاتە قوربانی تاکوو تاوانی مرۆڤایەتی بسڕێتەوە و بیگرێتە ئەستۆی خۆی. لێرەوە کوڕەکەی خۆی ناردۆتە خوارەوە بۆ ئەوەی ببێتە هەڵگری هەموو تاوانەکانی مرۆڤ. بەڵام ئەگەر وەك بیردۆزەکەی داروین دەڵێت وتمان مرۆڤ بەهۆی گەشەسەندێکی سروشتییەوە هاتۆتە بوون. بە شێوەیەکی هەروا و سروشتی لە خانەیەکەوە بەرەو کائیناتی ئەندامی و نافەقەریاتەوە بەرەو مەیموون و پاشان بووە بەم مرۆڤەی ئێستا. وەك بیردۆزەکە دەڵێت ئاڵقەیەکی ون بووە. ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێت کە ئادەم بوونی نەبێت، کاتێکیش ئادەم بوونی نەبوو، ئەو کات ئیتر موسیبەت و نەگبەتی گەورە ڕوو دەکاتە ئەم ئایینە، کە ئیتر ئەو کاتە نە لەخاچدان دەبێت و نە خۆبەختکردن و بەخشین (الفداء) و ئەو کاتەش ئایینی نەسرانییەت پاساوی بوونی نامێنێت.

کەواتە لە مافی کەنیسەیە -لە تێڕوانینی ئەوەوە- کە بە هەموو شێوەیەك و تا ئەوپەڕی توانای دژایەتی ئەم بیردۆزە بکات و نەیهێڵێت، چونکە هەرچی بناغە و بنەمانی ئایینی نەسرانییەت هەیە، هەڵیدەوەشێنێت و لەڕەگ دەری دێنێت. چونکە باوەڕبوون بەوەی کە ئادەم بوونی نییە، مانای وایە مەسیحیش بوونی نییە. ئەو کات لەخاچدان و خۆبەختکاریش دەبێتە ئەفسانە. چونکە مەسیح لەپێناوی تاوانەکەی ئادەمدا خوا هێناویەتییە سەرزەوی و لەخاچ دراوە! کەواتە ئیتر چی ماوەتەوە لە ئایین -ئایینی نەسرانی-.

لەسەر ئەمەوە کەنیسە بەرهەڵستییەکی توندی بیردۆزی داروینی کرد. ئیتر نەیارانی کەنیسە لە ڕۆژنامە، نووسەر، عەلمانییەکان و بێباوەڕان هاتن و بەشێوەیەك بیردۆزەکەیان بڵاو کردەوە و ڕەواجیان پێ دا کە داروین خۆشی خەوی

پێوە نەدیبوو. لەوانەیە هەر بە خەیاڵیشیدا نەهاتبێت کە بەم شێوە پەرە دەسەنێت. ئەوەش جێی سەرسامییە هەریەکە لە (لامارك **Lamarck**) و (بۆتیە) و کۆمەڵێکی تریش لە زانا و توێژەراوانی دیکە هەریەك لەوانە ویستیان بیردۆزکی وەك ئەوەی داروین یان شتێك سەربکێشێت بۆ ئەو بێنن، بەڵام نەیانتوانی و بۆیان بڵاو نەکرایەوە. چونکە بۆ ئەوەی لە بەرهەڵستکاری و بەرووشاخانی کەنیسە و کۆمەڵگا دوور بکەونەوە، بڵاویان کردەوە و وتیان کە حیکمەت و دانایی خوا وای پێویست کردووە کە ژیان بەو جۆرە بێتە پێش.

دوای بڵاوبوونەوەی بیردۆزی پەیدابوون "پەرەسەندن"، ئەورووپا لە هەموو بنکە و دامەزراوەکانی خوێندندا بڵاویان کردەوە و کردیانە پەیڕەوێکی گشتی بۆ گشت بوارەکانی ژیان؛ چونکە پشتی بە بیرۆکەی پێشکەوتنی زانستی بەستبوو، کە پێش داروین بە زیاتر لە شەست ساڵ لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا (ئوجوف کوم) باسی لێوە کردبوو. هەروەها لەپاشانیشدا مارکس هات و سوودی لەم بیردۆزە وەرگرت بۆ تەفسیرکردن و گەشەپێدانی بیرۆکەی ماددیەت و وتی کۆمەڵگا لەمیانەی هەر پێنج قۆناغەکەی شیوعییەتدا گەشە دەکات و بەرەو پێش دەچێت.

مەبەست ئەوەیە کە دێمۆکراسی، مرۆڤایەتی، تیۆرەکانی دەروونناسی و کۆمەڵناسی و ئەوانی دیکەش هەموویان لەم ئەفسانەیەوە سەرچاوەیان گرتووە. بۆیە دەبینین ئەزموونێك بەسەر مشکێك یان سەگێك یان مەیموونێك یان هەر ئاژەڵێکی تردا تاقی دەکەنەوە و پاشان دەیسەپێنن بەسەر مرۆڤدا و دەیانەوێت ئەو مشکە یان ئەو سەگە لە دەرەنجامی ئەو تاقیکردنەوە و ئەزموونەدا چی کردووە مرۆڤیش هەر هەمان شت بکات. واتە مرۆڤ لە تێڕوانینی ئەوانەدا جگە لە ئاژەڵێکی قسەزان هیچی تر نییە!

بەم شێوەیە کار گەیشتە دارمان و تیاچوونی مانای مرۆڤایەتی، هاتنەخوارەوەی ئاستی مرۆڤ و لە ئەنجامی لێکخشانی شۆڕشی پیشەسازی و ئەم بیرۆکانە بەگشتی دێمۆکراسی سەری هەڵدا و هاتە گۆڕێ. ئایین بەتەواوی وەلا نرا و کەنارگیر کرا. نەفس و دەروونی مرۆڤایەتی بەتەواوی بێڕێز کرا. دەوڵەتی عەلمانی لەسەر پەیڕەو و پیادەی مرۆڤ دامەزرا؛ واتە لەسەر پەیڕەوی هەوا و و ئارەزوو و ئەفسانە وەك باسمان کرد.

## ٣- پەیوەندیی تەسەوف بە ئەفسانە و عەلمانییەتەوە

ئەگەر ورد بینەوە و سەرنجێك بدەین لە هۆکاری هاتنەناوەوەی عەلمانییەت بۆ جیهانی ئیسلامی، دەبینین هەر هەمان هۆکارە کە تێیدا لە ئەورووپادا گەشەی کرد و بارودۆخی بۆ ڕەخسا؛ ئەویش بڵاوبوونەوەی خورافە و نەفامی و ئەفسانە بوو لەناو موسڵماناندا. چونکە ئەم بیرۆکەیە (عەلمانییەت) لە شوێنێکدا گەشە دەکات و پەرە دەسێنێت کە موسڵمانان بێئاگا بن لە ئایینەکەیان و ئەفسانە تێیاندا بڵاو بێت. خۆ ئەگەر موسڵمانەکان بەڕاست دەستیان بە ئایینەکەیانەوە بگرتایە و لە ژیانی خۆیاندا بەرجەستەیان بکردایە، عەلمانییەت دزەی نەدەکردە نێویان. وە لە هۆکاری هاتنەناوەوەی ئەفسانەش بۆ ناو موسڵمانان، تەسەوف و سۆفیگەرێتییە. تەسەوف وێنەیەکی ترە بۆ ڕاهبێتی و گۆشەنشینیی نەسرانییەت کە مەبەست دوورکەوتنەوەیە لە دنیا و وازهێنانە لێی. لێرەوە وازهێنانی تەواو لە دنیا و گرنگیدان بە دین وەك دەڵێن.

یەکەم کەسێك کە بینا و شوێنی کۆبوونەوە و پەیوەندی بۆ سۆفییەکان دروست کردبێت، ئەمیری (ڕەملە) بوو. ئەم کابرایە ئەمیرێکی نەسرانی گۆشەنشین بوو. لەسەر شێوازی دێری ڕاهیبەکان هات شوێنێکی بۆ سۆفییەکان دروست کرد. خۆی نەسرانی بوو، بەڵام ئەمەی بۆ ئەوان دروست کرد. دوای ئەوەی سۆفیگەری لە چەند تاکێکدا مامەڵە دەکرا، ئێستە وای لێ هات ئیتر شوێن و جێگەیان هەبێت و خەڵکی لێیان کۆ بێتەوە. ئینجا لێرەوە سۆفیگەری چووە قۆناغێکی ترەوە، کە قۆناغی گۆشەگیری و ڕەهبەنەتی نەسرانییەکانە. بەبێرێزی و بێئەرزشییەکی تەواو لە ژیانی دەڕوانی. بیرۆکەی جەبری کە کەنیسە هەیبوو، ئەمانیش وەریانگرت و پیادەیان کرد. ئەم لادان و لەڕێدەرچوونەش لە سەدەی چوارەمدا بەڕوونی و ئاشکرایی دەرکەوت. سەرەتای سۆفیگەریش لە زندیق و لەدیندەرچووەکانی شیعەوە دەستی پێ کردووە. خەڵکانێك خۆیان لەژێر باڵی شیعەگەرێتیدا حەشار دا و کەسانێکی دیکەش لەژێر ناوی سۆفیگەرییەوە.

شیعەش سەرکەوتن و دەسکەوتێکی گەورەیان بەدەست هێنا، چونکە بە ناوی خۆشەویستی ئالوبەیتەوە هاتنە ناو ئیسلام، تاکوو لەوێوە بیروخێنن و نەیهێڵن. سۆفییەکانیش لە خۆشەویستیی پێغەمبەرەوە هاتنە ناو. بۆیە کاریگەریی شیعە لە گەلانی ڕۆژهەڵاتدا کورت هەڵات وەك فارسەکان و وێنەی ئەوان، بەڵام سوفییەکان قوڵتر و ترسناکتر بڵاو بوونەوە؛ کاریگەریی خراپ و ڕووخێنەریان زیاتر بوو. چونکە کەسایەتیی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) گرت و سیفاتی ئولوهییەتیان پێ دا، کە نەسرانییەکان سەبارە بە عیسا باوەڕیان پێیەتی. بەڵام ئەمان وەك ئەوان نەیانوت کوڕ و فرستادەی خوایە. ئەمان عیلم و زانیاریی غەیب و پەنهانیان پێ دا.

بەمەش سەرچاوەی وەرگرتن (مصدر التلقي)یان نەهێشت و زاڵ بوون بەسەریدا. ئێمە دەڵێین پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وای فەرموو، سۆفیەکان دەڵێن نەخێر، ئێوە عیلمەکەتان لە مردوویەکەوە بۆ مردوویەکەی تر وەردەگرن؛ دەڵێن: فڵان کەس لە فڵانەوە ئەویش لە فلانەوە گێڕاویەتییەوە و بەو شێوەیە. واتە ئەوانە هەموو مردوون، بەڵام ئێمە لەو کەسە عیلم وەردەگرین کە زیندووە و نامرێت. زانست و عیلمی ڕاستەوخۆمان هەیە، جا ئەگەر مرۆڤ ویستی حوکمی فڵانە شت بزانێت، فەرموودەیەك بزانێت، سەحیح و دروستە یا نا، ئەوە نە سەحیحی بوخاری و نە سەحیحی موسلیم پێویست ناکات، بەڵکوو ئەوەندە هەزار جارە سڵاوات لەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بدات، فڵانە وێرد بڵێتەوە، ئیتر بخەوێت و ئەگەر لەو کەسانە بێت ڕێگەیان گرتۆتە بەر (السالكين) ئەوە لەخەودا بە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەگات و مەبەستی دێتە جێ. بەڵام گەیشتووەکان (الواصلون) ئەوە بە حاڵی بێداریدا (اليقضة)دا بە خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەگەن و پێی دەڵێت ئەی فڵانە کەس ئەوە بکە و ئەوە مەکە. فڵانە کەس بێنە، ئەمە حەڵاڵە و ئەوە حەرامە. ئەگەر یەکێکیش بەرهەڵستی کرد و وتی ئەم لە حەدیسدا هاتووە کە حەرامە، دەڵێت ئێوە عیلمەکەتان لە مردووەوە بۆ مردوویەك وەردەگرن، وە ئێمە ڕاستەوخۆ وەریدەگرین. ئیتر چۆن بەرهەڵستیمان دەکەیت؟!

ناسراویشە لایان کەشف و فەتح و فیوزات و ئەو شتانە، ئەوەی کە زۆر بەناوبانگە لای هەندێك لە سۆفییەکان خەڵوەت و بەتەنهاژیانە؛ بۆ ماوەی بیست ساڵ دەچێتە خەڵوەتەوە. لەو ماوەیەشدا نە جومعە و نە جەماعەت و نە خۆشتن و شتی وا، کە لەڕاستیدا تووشی شیرك و هاوەڵگیری دەبن، شەیتانەکان دێنە لایان و هەواڵیان بۆ دێنن. لە کاتی خەڵوەتدا کاتێك یەکێك دێتە لای، پێی دەڵێت تۆ فلانە کەسیت و بۆ ئەو شتە هاتوویت. ئیتر خەڵکی بەڕاستی دەزانن و وا ئەزانن ئەمە کەشف و کەراماتە.

ئیتر دینداری لە نەزەر و تێڕوانینی خەڵکیدا وای لێ هاتبوو ببووە ئەم تەریقەت و شێوازە، کە ئەمانە عیبادەت و بەندایەتی نین بە مانا ناسراو و زانراوەکەی. ئیتر مەفهوومی دین و دینداری ئەمە بووە لای ئەوان و جگە لەمەش دنیاویستی بوو، کە ڕێك وەرگێڕان و تەرجەمەی تەواوی عەلمانییەتە.

کاتێکیش هێرش و داگیرکردنی هزر و بیر ڕووی کردە مسوڵمانان، خاچپەرستان کەوتنە گیانی موسڵمانان و داگیریانکردن. ئوممەتی ئیسلام لەم جۆرە ئەفسانە و خورافە و نەفامییەدا نوقم ببوون، هەروەك نەسرانییەتی کۆن چی بەسەر هاتبوو.

ئیتر هەرچی یاسا و دەستوور هەیە لەم ڕێگەوە هاتە ناو مسوڵمانانەوە. لەو ڕێگەوە کە دنیا و ژیانی دنیا خۆمان نەخشەی بۆ دەکێشین و ڕێکی دەخەین و دەستوور و یاسای بۆ دادەنێین، وڵات دەکەینە یان دیمۆکراسی یان ئیشتیراکی یان هەر ناوێکی دیکە. چی شتێك ڕێگری ئەمەیە، خۆ ئەمە ڕێکخستن و دانانی حوکم و دەسەڵاتە نەك دینداری و تەشریع!

بەڵام ئایین، ئەوە شوێنی خۆی پارێزراوە کە مزگەوتە، یان تەکیە و خانەقا و ئەو شتانەیە لای سۆفییەکان. لەبەر ئەوە هیچ بەرهەڵستی و دژایەتییەکت لەنێوان هیچ حاکم و دەسەڵاتدارێك کە حوکم بە جگە لە فەرمانی خوا دەکات، یان هیچ نووسەرێکی مولحید و بێباوەڕ کە دژی ئیسلام دەنووسێت، هیچ جۆرە پیاهەڵشاخان و دژایەتییەك لەنێوان ئەمان و فیکر و بیری سۆفیگەریدا ڕووی نەداوە و ڕووش نادات. بەڵکوو نزیکی و لەگەڵیەکتربوون بووە بەردەوام، هەروەکچۆن لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەورووپا ڕێکەوتننامە لەنێوان دەسەڵاتدارانی ئەو کاتە و پیاوانی کەنیسەدا هەمیشە لەئارادا بوو.

چونکە سەپاندنی شەریعەت و بەرنامەیەکی جگە لە شەرعی خوا، یان فەرمانڕەوایی بۆ کردنی، لە کەسێکەوە بەرهەڵستی ناکرێت وا تێ گەیشتبێت کە دین تەنها کۆمەڵێك وێرد و ئەوراده و هیچی تر. خۆ ئەگەر گەورەترین دەسەڵاتداری تاوانبار هاتە لای، هەر ئەوەندە هەندێك وێرد و ئەورادی لێ وەرگرت، ئیتر ئەمە هەموو شتێکە. ئیتر با لەدواییشدا باوەڕی پێ نەبێت، یان حوکم بە شەریعەت نەکات، یان لە شەرع و بەرنامەی خوا لابدات و پەکی بخات، نوێژ بکات یان نەیکات، مەسەلەیەکی زۆر گەورە نییە، گرنگ ئەوەیە فلانە کەس سەر بە تەریقەتەکەی خۆی بێت و لە پیرێ و تەریقەتێکی تر نەبێت. بەڵام ئەوەی چی دەکات و چی ناکات، باوەڕی بە حاکمیەتی شەریعەت هەیە یان نییەتی، ئەمە مەسەلەیەکی لاوەکییە و جێی سەرقاڵی نییە.

## تەرجەمەی یەکێك لە سوفییە خورافییەکان

حەزم کرد لێرەدا بۆ ئەوەی کاریگەری و ڕۆڵی ئەفسانە و خورافە لە بڵاوبوونەوەی عەلمانییەت لە جیهانی ئیسلامیدا بزانین، باس لە یەکێك لە سەرانی سۆفیگەری بکەین و هەندێك لە قسە و هەڵوێستەکانی بخەینە ڕوو ئەویش (ئەحمەد ڕیفاعی)یە.

ئەویش کەسێکی ناسراوە و شێخی ئیسلام مونازەرەی لەگەڵ کردووە. لە دووتوێی ئەم باسەدا شتی سەرسام و سەرسوڕهێنەر دەزانین، ڕووی لێکچوو لەنێوان قسەکانی ئەو و قسەکانی کەنیسەی سەدەکانی ناوەڕاست حاڵی دەبین.

ئەحمەد ڕیفاعی دەڵێت: "ئەگەر بەندە توانی و بۆی کرا بگاتە حاڵ و ئەحواڵی وا بگاتە شوێنی نزیکی لە خوای گەورە، هیممەت و گوڕوتینی وای لێ دێت کە زەوی و هەر حەوت ئاسمانەکە دەبڕێت. وە زەوی وەك پاوانەی لێ دێت لە قاچیدا. وە دەبێتە سیفەتێك لە سیفاتی حەق تەعالا. وە هیچ شێتکی لەدەست دەرناچێت و هیچشتێك بێتوانای ناکات. وای لێ دێت کە حەق (خوای گەورە) ڕازی دەبێت بۆ ڕەزامەندیی ئەو و تووڕەیش دەبێت لەپێناوی تووڕەبوونی ئەودا. وە بەڵگەش بۆ ئەوەی کە وتمان ئەوەیە لە هەندێك کتێبی خواییدا هاتووە کە خوا دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم، گوێڕایەڵیم بکەن گوێڕایەڵیتان دەکەم. هەڵمبژێرن هەڵتاندەبژێرم. لێم ڕازی بن لێتان ڕازی دەبم. خۆشمتان بوێت خۆشم دەوێن. چاودێریم بکەن چاودێریتان دەکەم و واتان لێ دەکەم بۆ کردنی شتێك بڵێن ببە دەبێت **(كن فيكون)**."

ئیتر ئەم کەراماتە چاوگەکەیان هەموو **(كن فيكون)**ە. خوا دەیداتە دۆستانی خۆی و پێیاندەبەخشێت، وەك گومان و لافی ئەوانە!

شەعرانی دەڵێت: "ئەگەر (ئەحمەد ڕیفاعی) لەسەر جلەکانی دابنیشتایە، لەسەری دەمایەوە تاکوو دەفڕی و منیش لە سێبەری دادەنیشتم. وە ئەگەر پشیلەیەك لەسەر دەستی بخەوتایە و کاتی نوێژ بهاتایە، لەژێرەوە دەستی دەبڕیەوە و پشیلەی بەئاگا نەدەهێنایەوە و دەچوو بۆ نوێژ. کاتێکیش لە نوێژ دەگەڕایەوە دەستی بە خۆیەوە دەدوورییەوە و دەیلکاندەوە بەیەکەوە. جارێکیان -خوا لێی ڕازی بێت- سەگێکی گەڕی بینی کە ماڵی ئومعوبەیدە -ئەو دێیەی تێیدا بوون- ڕاویان نابوو. ئەمیش لەگەڵیدا دەرچووە دەشتودەر و سێبەری بۆ دەکرد. ئیتر بە ڕۆن چەوری دەکرد و نان و ئاوی پێ دەدا. سەگە گەڕەکە برینێکی لێ هاتبوو، کاتێك چاك بۆوە ئاوێکی گەرمی هێنا و شوێنەکەی شۆرد. خوای گەورە فەرمانی تێڕوانین و حاڵیبوونی لە کاروباری ئاژەڵەکانیشدا بەسەردا دابوو. ئەگەر هەژارێکی بدیایە کێچێك یان ئەسپێیەکی لەشی دەکوژێت دەیگوت: "نا ڕەحمەتت لێ بێت! ڕقی خۆت بە کوشتنی کێچێك خواردەوە." جارێك گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت: "خوا پێنج هەزار ناوی هەیە." ئەویش پێی وت: "خوای تەعالا بەئەندازەی دەنکە لم و دار و درەخت و ئەوانی تریش ناوی هەیە." وە بە هەرکەسێك بگەیشتایە، ئەم سەرەتا سەلامی لێ دەکرد؛ تەنانەت لە ئاژەڵ و سەگەکانیش سەلامی دەکرد. وە ئەگەر

بەرازێکی بدیایە دەیوت: "بەیانیت باش." پێیان وت: "بۆ تەنها بۆ بەراز دەڵێیت بەیانیت باش و بۆ ئاژەڵەکانی تر سەلامیان لێ دەکەیت؟!" وتی: "خۆم لەسەر شتی جوان ڕادێنم."

ئەگەر بزن یان مانگای بدیایە، دەیوت: "السلام علیکم." بەڵام بەراز چونکە گۆشتی ناخورێت سەلامی ئەهلی نەفامی لێ دەکردن و دەیوت: "بەیانی یان ئێوارەت باش." چونکە پابەند بووە بە ئایینەوە!

وە خوا لێی ڕازی بێت ئەگەر بچوایەتە سەر کورسیی هەڵنەئەستا، بەڵکوو بە دانیشتنانەوە قسەی دەکرد. دوورونزیك وەکیەك گوێیان لە قسەکانی دەبوو. تەنانەت دێهاتەکانی چواردەوری ئومعوبەیدە لەسەر ماڵەکانی خۆیانەوە گوێیان لە قسەکانی دەبوو. هەرچی ئەوەی دەیوت دەیانزانی و تێی دەگەیشتن، تەنانەت کەڕ و لاڵەکانیش ئەوانەی حازری قسەکانی دەبوون، خوا دەرگای لێ دەکردنەوە و لەو کاتەدا تێی دەگەیشتن. شێخ و مەشایەخی تەریقەت هەموو دەهاتن و دادەنیشتن لە قسەکانیدا وهتد...

ڕۆژێك لە دێیەکە دانیشتبوو. ملی درێژ کرد و وتی لە گەردنی من، هەموو سەرسام بوون و وتیان: "ئەوە چییە؟!" وتی: "شێخ عەبدولقادری گەیلانی، ئێستە لە بەغدایە، وتی پێم لەسەر گەردنی هەرچی وەلی و دۆستی خوایە -چونکە شێخیش وەلی خوایە، ملی درێژ کرد بۆ پێی ئەو- ئیتر ڕاکشا و درێژ بوو. بەتەنیا هەر خۆی بوو دانیشتبوو. پیاوێك لە هەواوە هاتە لای، لەبەردەمیدا دانیشت. شێخ وتی مەرحەبا بە شاندی ڕۆژهەڵات و بەخێر هاتن. کابرا وتی ئەوە بۆ بیست ڕۆژە من نە شتێکم خواردووە و نە شتێکیشم خواردۆتەوە؟ من دەمەوێت شەهوەتم بدەیتێ. وتی شەهوەتەکەت چییە؟ دەڵێت: سەیری چواردەوری کرد و پێنج مراوی بینی لەو ناوەدا. وتی یەکێك لەمانەم بەبرژاوی لەگەڵ دوو نانی جۆ و پەرداخێك ئاو دەوێت. شێخ وتی ئەم بۆتەیە. پاشان شێخ سەیری مراوییەکانی کرد و وتی پەلە بکەن لە بەجێهانی ئارەزووی شێخدا. دەڵێت: قسەکەی تەواو نەکرد یەکێکیان بەبرژاوی هاتە بەردەمی. پاشان شێخ دەستی درێژ کرد بۆ دوو بەرد کە لەولایەوە دانرابوون - هەردوو بەردەکەی لەگەل مراوییەکەدا بۆ دانا- کەچی یەکسەر بوونە دوو کولێرەی گەرم لە جوانترین شێوەی کولێرە. پاشان دەستی درێژ کرد بۆ هەوا و کە سەیر دەکەین ئەوا جامێکی سووری پێیە و ئاوی تێدایە. دەڵێت (میوانەکە) خواردی و خواردییەوە. پاشان (جامەکە) چووەوە بۆ ناو هەوا و بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبوو. وە شێخ -خوا لێی ڕازی بێت- هەڵسا و ئێسقانەکانی باڵندەکەی کۆ کردەوە، خستنییە نێو دەستی چەپی و دەستی ڕاستی خستە سەریان و وتی: "ئەی

ئێسکوپروسکە پەرت و لێکپچڕاوەکان، بڕۆ و بفڕەوە بە فەرمانی خوا (عز وجل)، بسم الله الرحمن الرحيم. وتی: "بووەوە بە مراوییەکەی یەکەمجار و فڕییەوە تا لەبەر چاوم نەما." جا ئەم ڕاوییە ئەم قسەیە بەم شێوە دەگێڕێتەوە!

شتێکی تری سەیروسەمەرە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو چەکی لێخۆشبوونەی نەسرانییەکان دروستیان کرد و گەورەترین هۆکاری شۆڕش و ڕاپەڕینی ئەورووپا بوو بە ڕووی کەنیسەدا. لێرەشدا لای ئەم ئەفسانەچی و خورافییانە باسی لێوە کراوە. چەکی لێخۆشبوونیش ئەوە بوو کە پیاوی ئایینی (قەشە یان لەو پلەدارتر) پارچەیەك زەوی لە بەهەشت و چەکێکی بە کڕیار دەدا و ناوی خۆی و باوك و باپیری لێ دەدا و گرێبەست لەنێوان کەنیسە و کڕیاردا مۆر دەکرا و لە دەرەنجامی ئەمەشدا کڕیارەکە هەرچی بکردایە لەدوای ئەمە ئازاد بوو. هەر تاوانێکی بکردایە لێپرسینەوەی نەبوو، چونکە ئەو پارچەیەکی باشی لە بەهەشت کڕیوە و تاپۆکەی وەرگرتووە. جا مرۆڤی ژیر هەر بە سەلیقە و بەدیهەت ئەمە ڕەد دەکاتەوە و نایسەلمێنێت. تەنانەت هزری ڕۆژئاواییش زۆر بەتوندی پەرچی داوەتەوە. تەنانەت کەنیسەش زۆر بەشەرم و بەخۆداچوونەوەوە باس لەو مێژووە دەکات و بە هەر جۆرێك بێت دەیەوێت بیشارێتەوە. جا ئەم وێنە ڕەشەی ئەورووپا لە مێژووی ئیسلامیشدا ڕووی داوە!

ئەحمەد ڕیفاعی چەکێکی بۆ یەکێك لە خەڵکی نووسیوە. شێخ هاتۆتە لای ئەم پیاوە و داوای بێستانەکەی کردووە. شێخ باخەکەی لێ دەستێنێت. پیاوەکەش پێی دەڵێت: "باخێکم لەبریتی ئەمە لە بەهەشتدا دەدەیتێ؟" دەڵێت: "ئەگەر بمانەوێت ئاسمانەکان و زەویت پێ دەدەین. ئەمە کارێکی ئاسانە." پیاوەکە دەڵێت: "دەی کەواتە چەکێکم بۆ بنووسە." ئەویش بەم شێوەیە بۆی دەنووسێت:

**بسم الله الرحمن الرحيم**

"ئەمە ئەوەیە کە بەندەی هەژار ئەحمەد کوڕی ئەبووحوسەینی ڕیفاعی لەسەر کەرەم و فراوانی خوای گەورە زەمانەتی داوە بە ئیسماعیلی کوڕی عەبدولمونعیم، کۆشکێك لە بەهەشتدا پێ داوە، کە چوار سنووری ئەملاولای هەیە: یەکەم: تاکوو بەهەشتی (عەدن) دەڕوات. دووەمیان: تاکوو بەهەشتی (المأوى) و سێیەمیان: تاکوو بەهەشتی (الخلد) و چوارەمیشیان: تاکوو بەهەشتی (الفردوس). ئەمانە بە هەموو حۆری، منداڵ، ڕاخەر، باخ، خێزان، ڕووبار و دار و درەختییەوە. ئەمەش هەموو لەبریتی ئەو بێستانەی لە دنیادا هەیبوو. خواش شایەتە و کەفیلە بەمە. پاشان نووسراوەکە دادەخات و دەیدات بە کابرا."

ئەمەش لە کتێبی (**جامع كرامات الأولياء للنبهاني**)دا هاتووە.

شایەت لێرەدا ئەوەیە کە ئەو خورافە و ئەفسانەیەی لە ئەورووپادا ڕووی داوە و لەوێوە عەلمانییەت هات، بە خراپترین شێوەی لە مێژووی ئیسلامیشدا ڕووی داوە. ئینجا لە دەرەنجامی ئەم ئەفسانەیەدا و لە ئاکامی دوورکەوتنەوەمان لە ئایینەکەمان و لە دەرەنجامی ئەو چەمك و تێگەیشتنە هەڵەیەی تێیگەیشتووین کە ئایین پەیوەندییەکی تاکەکەسی و سنووردراوە، هەروەك تەسەوف بەو شێوە لە زەین و بینشی خەڵکیدا دایناوە، ئیتر بەم شێوەیە ئەم بیرۆکانە هاتنە ناومانەوە و لە ئەنجامی نەبوونی تێگەیشتن و پیادەکردنی ئیسلام بە شێوەیەکی دروست، ئەم بیرۆکانەمان وەرگرت و لە ئەفسانەیەکەوە بەرەو ئەفسانەیەکی تر هەنگاومان نا.

بۆ نموونە: بانگەوازی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- لە کاتێکدا سەری هەڵدا ئوممەتی ئیسلامی لە چاخی دارمان و داڕووخانێکی بەهێزدا تێدەپەڕی. لەگەڵ ئەوەشدا شێخ باسی هەر پێنج جۆرەکەی تاغووتی کردووە: شەیتان، ئەو حاکمەی فەرمان بە جگە لەوە دەکات خوا هێناویەتیە خوارەوە، ئەو حاکمە ستەمکارەی فەرمانی خوا دەگۆڕێت، ئەو کەسەش کە بانگەشەی زانستی غەیب و پەنهان دەکات و ئەو کەسەش کە بانگەشەی بەندایەتیکردنی خۆی دەکات.

هاتووە هەر پێنج تاغووتەکەی تەفسیر کردووە. جا ئەم عەلمانییەتە لە سەرێکەوە حوکم و فەرمانڕەواییە بە حوکمی جگە لە خوا و لە سەرێکیشەوە بانگەشەکردنی زانینی عیلمی غەیبە کاتێك مافی یاسادانان دەداتە خۆی. لەو کاتەشدا بانگەشەکردن بۆ غەیب بە ناوی کەرامات و کەشف و ئەو شتانەوە بەتەواوی بڵاو بووبۆوە و پەرەی سەندبوو. جا هەر کاتێك عەقیدە و بیروباوەڕ ڕاست بۆوە و پوختە کرا، ئیتر عەلمانییەت قەبووڵ ناکات و باوەڕی بە ئەفسانەیەکی وا نییە، هەرچەندێك خۆی بڕازێنێتەوە ئاستی بەرز بێت لە دنیادا.

بەڵام کاتێك عەقیدە فاسید دەبێت و خراپ دەبێت، کاتێك تووشی ئەفسانە دەبێت، ئیتر ئەم عەلمانییەتە بە هەموو جۆرەکانییەوە ڕوومان تێ دەکات و بە هەموو ڕێڕەوەکانییەوە گەمارۆمان دەدا. لە دەسەڵاتدا، لە سیاسەتدا، لە نیزام و دەستووردا، لە تەعلیم و خوێندندا وهتد...

جا کاتێك ئاستی تێگەیشتنی موسڵمانان گەیشتە ئەو ڕادەی کە دین لە چەند ڕکاتێك لە مزگەوتدا بخوێنرێت و یان چەند زیکر و وێردێك بێت و هیچی تر، ئیتر هیچ پەیوەندییەکی تری بە ژیانەوە نەبێت، ئەو کات تۆی موسڵمان بە هیچ

شێوەیەك بۆت نییە بەرهەڵستی بکەیت، چونکە لە کار و ئیشی تۆ نییە و کاری تۆ تەنها چواردیواری مزگەوتە.

## ٤- پوختەی ئەو سوودانەی لەم بابەتە وەردەگیرێن

- سەرەتای مێژووی نوێی ئەورووپا لە فەتحی قوستەنتینییە لەسەر دەستی (محمد الفاتح) دەستی پێ کرد.
- (پۆلس)ی جوولەکە خاوەن ئەو مەسیحییەتەی ئێستەیە کە بەم شێوە ناسراوە.
- عەلمانییەت بریتییە لە جیاکردنەوەی ئایین لە واقعی ژیان.
- گۆشەگیری داهێنراوێکی پیس و فاسیدە و گۆشەگیرەکان لەگەڵ ئافرەتانی ناو کەنیسەدا زینایان دەکرد و پاشان منداڵەکانیان لەناو کەنیسەکەدا لەچاڵ دەخست هەتاکوو کەس پێی نەزانێت.
- قۆناغێك بەسەر ئەورووپادا تێپەڕی زانکۆکانیان زمانی عەرەبی تێدا دەخوێنرا و ئەوەی زمانی عەرەبی نەخوێندایە بە ڕۆشنبیر لەقەڵەم نەدەدرا.
- ئیبن‌ڕوشد لای ئەورووپاییەکان لە گەورەترین ئەو کەسانەیە کە سوودی بە ڕاپەڕینی ئەورووپا گەیاندووە و هەر ئەو بوو کتێبەکانی ئەرستۆی وەرگێڕا.
- ئەورووپاییەکان سوودیان لە شارستانێتییەکەمان وەرگرت لەوەی سوودی بۆیان هەبوو و موسڵمانەکایش ئەوەی زیانی هەیە بۆیان ئەوەیان لە ژیاری ئەورووپایی وەرگرتووە.
- زانایانی چاخی ڕاپەڕینی ئەورووپایی زۆربەیان زانایانی دین بوون.

---

[1] جوولەکە هەوڵێکی زۆریان دا تا ئایینی ئیسلامیش بەدەردی نەسرانییەت ببەن، ئەوەبوو هەر لەسەردەمی خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەففان -خوا لێی ڕازی بێت- جوولەکەیەکی یەمەنی بە ناوی (عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئـ) خۆی خزاندە ناو ڕیزی موسڵمانانەوە. لەوێوە هەمان بانگەشەی (پۆلس)ی کرد، بەڵام بە شێوەیەکی تر بۆ نموونە یەکێك لەو خاڵانە وتی: هەموو پێغەمبەرێك وەسیی هەبووە و عەلیش وەسی پێغەمبەرە. جوولەکە ویستیان چۆن نەسرانییەتیان وێران کرد، ئاوەهاش ئیسلام لەبن بێنن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم ئایینە خوا دەیپارێزێت، هەوڵ و تەقەلایان بێئاکام مایەوە و نەیانتوانی بەتەواوی ئیسلام بگۆڕن. بەڵام کوڕی سەبەئـ توانی کۆمەڵێکی زۆر لەم ئوممەتە بکات و عەقیدە و بیروباوەڕیان بگۆڕێت و بەرەو شیرك و هاوەڵگیری بیانبات، کە ئەمڕۆ پێیان دەگوترێت شیعە.